

# شاری دڵ

## دیوانی ئاوات

سەید کامیلی ئیمام زەنبیلی (کامیل شا)

# شاری دڵ

دیوانی سەید کامیلی ئیمامزەنبیلی (ئاوات)

(کامیل‌شا)

ئامادەکار:

سەید جەعفەر ئیمامزەنبیلی

١٣٩٢/ ٢٠١٣

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | امامی زنبیلی، کامل |
| عنوان و نام پدیدآور | : | شاری دل : دیوانی سەید کامیلی ئیمام زەنبیلی (ئاوات) (کامیل‌شا)/ ئامادەکار سەید جعفر ئیمام زەنبیلی. |
| مشخصات نشر | : | تهران: آنا، ۱۳۹۲. |
| مشخصات ظاهری | : | ۴۶۳ ص. |
| شابک | : | ۹۷۸-۶۰۰-۶۲۹۲-۲۰-۵ |
| وضعیت فهرست‌نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | شعر کردی -- قرن ۱۴ |
| شناسه افزوده | : | امام زنبیلی، سیدجعفر، گردآورنده |
| رده بندی کنگره | : | ۳۲۵۶PIR س۷۴۳الف ۷۳ ۱۳۹۲ |
| رده بندی دیویی | : | ۲۱/۹فا۸ |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۳۳۹۶۹۶۷ |

## شاری دڵ

**شاعیر:** سەید کامیل ئیمامزەنبیلی (کامیل‌شا)

**ئامادەکار:** سەید جەعفەر ئیمامزەنبیلی

**پێداچوونەوە:** ئەحمەد مەولانی و سەلاحەددین ئاشتی

**پیتچن:** محەمەدئەمین شاسەنەم

**رووبەرگ:** مەسعوود نیکخاهـ

**سەرپەرشتی چاپ:** شوانە تاهیری

**بڵاوکەرەوە:** ئانا ـ تاران

**نۆرەی چاپ:** ئەوەڵی ئانا، ۲۰۱۳/۱۳۹۲

**ئەژمار:** ۳۰۰۰ دانە

**نرخ:** ۱۸۰۰۰ تمەن

**ناوەندی بڵاو کردنەوە:** سنە ـ کتێبی کانی ـ ۰۸۷۱_۲۲۲۵۲۵۹

سەقز ـ فەرهەنگسەرای هونەر و ئەندیشە ـ ۰۹۱۸۷۷۷۱۵۸۵


نشر آنا

## نێوەرۆک
(بەپێی ناوی شێعرەکان)

**بەشی فارسی.........٣٥٣**

## نێوەرۆک

(بەپێی میسرەعی یەکەمی شێعرەکان)

### غەزەل.........٥٧

**تەرجیعبەند، تەرکیببەند......... ۲۷۵**



**مەسنەوی......... ۲۹۱**

# پێشەکی

## کورتە مێژووی بنەماڵەی شێخانی زەنبیل

سەید عەبدولکەریم، کوڕی سەید عەبدوڕڕەحمانی «کانی‌توو»، کوڕی سەید محەممەدی تەرەتەوەن، بەپێی بۆچوون دەبێ ساڵی ١٢١٧ ـــ ١٢١٨ی هەتاوی (١٨٣٨- ١٨٣٩ی زایینی) لە یەکێک لە گوندەکانی «کانی‌توو، بێژاوا یا بێ‌لەنگە»ی سەر بە شاری "هەڵەبجە" لە دایک بووبێ، کە شێخ عەبدوڕڕەحمان لەو سێ دێیە نیشتەجێ بووە و بە یازدە پشت دەچێتەوە سەر مەلا ئەبووبەکری «موسەننیف»ی چۆڕی و زەمانی خۆی لە لایەن «شێخ عەبدوڕڕەحمانی تاڵەبانی»یەوە کە لە شێخانی تەریقەتی قادری بووە دەکرێتە خەلیفە.

بەپێی ئاژوانی ڕۆژگار، سەید عەبدوڕڕەحمان ناو و ناوبانگی بە «شێخ» دەڕوا و وەکوو پیاوماقووڵێکی ئایینی دەناسرێ. لەو هەل و هات و کاتەدا شێخ عوسمانی تەوێڵە، ناسراو بە شێخی سیڕاجەددین، سەیدزادە «تەیبە»ی کچی شێخ عەبدوڕڕەحمان دەخوازێ بۆ شێخ محەممەد بەهائەددینی کوڕە گەورەی خۆی.

تێکەڵاوی و خزمایەتی لەگەڵ شێخانی تەوێڵە هەل بۆ سەید عەبدولکەریم دەڕەخسێنێ هەتا بۆ خوێندن ڕوو بکاتە خانەقا و حوجرەی تەوێڵە و لەوێ دەگیرسێتەوە و هەتا دەبێتە «موستەعید» لەوێ دەخوێنێ. هەر لەو سەردەمەش‌دا دەستووری تەریقەت لە خزمەت شێخی سیڕاجەددین وەردەگرێ و ئەویش دەیکاتە زاوای خۆی و شێخزادە «ئامینە»ی کچی دەداتێ.

پاش تێپەڕبوونی ئەم قۆناخەی ژیان، ساڵی ١٢٣٧ یا ١٢٣٨ی هەتاوی (١٨٥٨- ١٨٥٩ی.ز) بۆ درێژەی خوێندن دەینێرێتە گوندی «تورجان» لە ناوچەی موکریان.

تورجان لەو سەردەمەدا لەبەر وجوودی عەللامە مەلا عەلی قزڵجیی تورجانی (١٢٢٥ – ١٢٩٥ی کۆچی= ١٨١٠- ١٨٧٨ی.ز) ناوبانگی بە «دارولعیلم» ڕۆیشتووە و لە کوردستان بە یەکێک لە ناوەندە گرینگەکانی زانست و خوێندن دانراوە. وەک دەڵێن ئەگەرچی خوالێخۆشبوو قزڵجی نەچۆتە سوێی دەرس و دەوری فەقێی بەرەژێر، بەڵام چونکە سەید عەبدولکەریم هەڵگری نامە و ڕاسپاردەی شێخی سیراجەددین بووە، لە حەوتوودا دوو یا سێ دەرسی پێ کوتووە.

حاجی سەید عەبدولکەریم پاش وەرگرتنی ئیجازەی مەلایەتی دەگەڕێتەوە بۆ هەورامان و گوندی تەوێڵە، بەڵام هەتا دەگاتەوە، ئامینە خاتوونی خێزانی بە سەر منداڵێکەوە دەچێ، بە ناوی «عەبدولحەکیم». پاش نەمانی ئامینە خاتوون، هەر لەو بنەماڵەیە کچێکی دیکە دەدەن بە سەید عەبدولکەریم بە ناوی شێخزادە «حەبیبە» کە هەر کچی شێخی سیراجەددین بووە. ئەم ژنەش لە تەمەنی لاویدا لە سەر کچێک دەچێ بە ناوی سەیدزادە «مەهتاب». لە مەودای تێپەڕینی زەماندا سەید عەبدولحەکیم و سەیدزادە مەهتاب کە هەم خوشک و برا بوون و هەم پوورزا، لە هەورامان خڕەکە دەبن. لە جەنگەی گەڕانەوەی باوکیاندا بۆ موکریان، ئەوانیش دێن و دەبنە هاوسەفەری.

دوای ماوەیەک ئەوجار شێخ محەممەد بەهائەددین، شێخزادە «حەلیمە»ی کچی خۆی دەدا بە سەید عەبدولکەریم. لە درێژەی ڕۆژگاردا سێ کوڕ لە داوێنی ئەم شێخزادەیە بەر دەبنەوە کە بریتین لە: عەبدوڕڕەحمان (حاجی بابەشێخ)، حوسێن و موئمین. پاش ئەم

کوڕانە هێندەی پێناچێ کە شێخزادە «حەلیمە»ش بەرەو بارەگای خودا دەگەڕێتەوە و لە «مەرقەدان»[1]ی دێی زەنبیل دەنێژرێ.

دواتر حاجی سەید عەبدولکەریم کچی شێخولئیسلامی سەردەشت دەخوازێ و دوو کوڕ و دوو کچی لێی دەبێ کە بریتین لە عەبدوسسەلام، حەمەدەمین، خاسان و ئافتاب. سەیدزادە خاسان دەدرێ بە برا چکۆلەی شێخ عەلی حیسامەددین بە ناوی «کاکەشێخ» کە جوانەمەرگ بووە و سەیدزادەی خێزانی هەتا ئاخری تەمەنی شوو ناکاتەوە و هەر لە تەوێڵە دەمێنێتەوە و پاشەواری لە پاش بەجێ نامێنێ و هەر لەوێش دەنێژرێ. سەیدزادە ئافتاب دەدرێ بە شێخی تەوێڵە واتە شێخ عەلی حیسامەددین و ئەویش بەبێ منداڵ لە تەمەنی گەنجیدا بەرەو خەزێنەی خوایی دەگەڕێتەوە و لە تەوێڵە دەنێژرێ.

حاجی سەید عەبدولکەریم لە ماوەی ساڵانی ۱۲٤۱-۱۲٤۲ی هەتاوی (۱۸٦۲-۱۸٦۳ی.ز) لە لایەن شێخی سیراجەددینەوە دەکرێتە خەلیفە و دێ لە گوندی «تورجان»ی ناوچەی موکریان بنەی دادەمەزرێنێ و دەبێتە پێشەنگی ئیرشادی «تەریقەتی نەقشبەندی». لە سەرەتاوە وەکوو دەروێشێک لە مووچەی «گوێزان»ی پشت ماڵی

[1] مەرقەدان یان حەوتمەرقەدانی زەنبیل، لەگەڵ وەفاتی سەرجەلە و بناغەدارێژی بنەماڵەی شێخانی زەنبیل واتە خوالێخۆشبوو حاجی سەید عەبدولکەریم هاتۆتە دی. ئەو حەوت کەسەی دوابەدوای یەکتر لەوێ نێژراون بریتین لە: ۱. حاجی سەید عەبدولکەریم ۲. سەید عەبدولحەکیم (شایحەکیم) ۳. شێخزادە «حەلیمە»ی کچی شێخ محەمەد بەهائەددین و خێزانی سەید عەبدولکەریم ٤. دایە «خاتوون»ەی خێزانی حاجی سەید عەبدولکەریم و کچی «شێخولئیسلامی سەردەشت» ٥. حاجی سەید حەمەدەمینی کوڕی حاجی سەید عەبدولکەریم ٦. سەیدزادە toوبا کچی شایحەکیم ۷. سەید موئمین کوڕی سەید عەبدولکەریم. ئەم حەوت کەسە قسنێکیان لە دەورەی دەکێشرێ و بە «حەوتمەرقەدان» ناودێر دەکرێ.

تورجان خانووچکە و ساباتێک پێکەوە دەنێن و دەست دەکا بە ئیرشاد و بڵاوکردنەوەی بیر و باوەڕی عیرفانی.

خاوەنموڵکی «تورجان» و دەوروبەرەکەی یانی ئاغا حەمەدەمینبەگی گەورە لە پیاوچاکانی زەمانی خۆی بووە و کوڕی ئاغا «قۆجبەگ»ی گەورە و «نوورنیساخانم» بووە کە هەر بە بنەماڵە بە خێرۆمەند و چاودێری مەلا و فەقێ ناوبانگیان ڕۆیشتووە، مەزرای «زەنبیل» باربووی حاجی سەید عەبدولکەریم دەکەن و دەبنە دەسگیرۆی سازکردنی خانەقا لە «جەمیان».

حاجی سەید دوای چەند ساڵێکی دیکە، مەزرای زەنبیلیش ئاوەدان دەکاتەوە و خانەقایەکی لێ دروستدەکا و «شایحەکیم»ی کوڕە گەورە و جێنشینی خۆی لێدادەنێ. سەرەنجام ساڵی ١٢٩١ی هەتاوی (١٩١٢ی.ز) دەستی لە داوێنی ژیانی نەمێن بەردەدا و بەرەو هەوارگەی یارانی ڕابردووی دەگەڕێتەوە.

پاش نەمانی سەید عەبدولکەریم، ماڵ و خانەقا لە گوندی جەمیان کۆدەبێتەوە و گوندی زەنبیل دەبێتە ناوەندی خانەقا و عیرفان. بەم شێوەیە بناغەی بنەماڵەی زەنبیل لە ناوچەی موکریان دادەڕێژرێ.

سەید عەبدولحەکیم لە زەمانی باوکیدا دەبێتە زاوای حاجی ئەحمەدبەگی «کەندەسوورە»ی بانە و فاتمە خانمی کچی دەخوازێ. ئەم بەگزادەیە چوار منداڵی دەبێ کە دەبنە محەمەد، کامیل، توویا و ئامینە.

پاش ئەوەی کچەکان ڕەسیدە دەبن، سەیدزادە توویا دەدەن بە شێخ عوسمانی برا چکۆلەی شێخ عەلی حیسامەددین (شێخی حیسامەددین)، بەڵام شێخ جوانەمەرگ دەبێ و سەیدزادەش مێرد ناکاتەوە هەتا تەمەنی دەبڕێتەوە. ئامینە خاتوون دەدەن بە شێخ «موعتەسەم»ی کوڕی شێخی حیسامەددین، بەڵام پاشان تووشی

تەڵاق دەبێ و ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی (١٩٤٥ی.ز) لە شاری مەهاباد ئەمری خودا بەجێ دێنێ و هەر لەو شارە دەنێژرێ.

حاجی سەید محەممەد نوورانی کوڕی گەورە و جێنشینی سەید عەبدولحەکیم، شێخی ئیرشاد و خواناس و پیاوێکی هەرە باش و نەتەوەدۆستی سەردەمی خۆی بووە. شێخ کە لە مەیدانی دین و عیرفاندا توانیویەتی ئەسپی فام و زانینی تاوبدا، لە بوار و بەستێنی شێعر و ئەدەبیاتیشدا کەموکورتی نەهێناوە و دەستی خۆی ڕەپێش داوە و بە کوردی و فارسی و عەرەبی شێعری هۆنیوەتەوە. نامەوێ بە هێنانە بەر باسی ئەو بەستێنە بەرین و بێسنوورە بابەتەکە بەرەو بوارگەی دیکە باڵ بنگێوێ، هەر بۆیە بە هێنانی پارچە شێعرێک لە کۆمەڵە شێعرەکانی حاجی سەید محەممەد (شاینوورانی = غالیب)، ئەم بەشە دادەکووژێنم. ئەم غەزەلە بە پیرەوەچوونی غەزەلە مەشهوورەکەی سەید کامیلی برا چووکەیەتی کە ئاوا دەست پێدەکا:

*نووری ڕوخسارت وەدەرخە، دەردی بێدەرمانە شەو*
*زوڵمەتی زولفت لە سەر ڕووتە، لە ڕۆژ میوانە شەو*

## سوبح

تەلعەتت با دەرکەوێ، بێتاقەتی هیجرانە سوبح
ئاهـ سەرد و نائومێد و هەمدەمی حیرمانە سوبح
خوێن لە داوێنی فەلەک نیشت و گەواهی دا شەفەق
یەعنی بۆ شەمسی جەماڵت، کوشتە و قوربانە سوبح
گوڵ دوڕئەفشانی دەکا بەو قەترەقەترە شەونمە
تاوەکوو ڕووی تۆ دەبینێ، کاری هەر گریانە سوبح
گەر دەموچاو و قەدی ڕەعنای دڵارامی نەدی
چۆن بە خونچە و نەرگس و سەروی سەهی خەندانە سوبح؟

گوێ لە بولبول بگرە سبحەینان بە سۆزی دڵ دەڵێ
مووسمی ئاه و فوغانی دڵبریندارانە سوبح
هەستە «غالیب» بەستە خەو، وەختە بیناییت کوێر بکا
سەیقەڵی ژەنگی گلێنەی چاوی بێدارانە سوبح

**ژیاننامەی سەید کامیل (ئاوات)**

سەید کامیل لە ژیاننامەیەکدا کە بە قەڵەمی خۆی نووسیویەتی دەڵێ:

لە ڕابردووی ژیانم گەر دەپرسن
ئەگەر بیڵێم، دەترسم لێم بترسن
بڵێن چۆن بەو هەموو دەردانە هەر ما
مەگەر دێو و درنج بێ کابرای وا!

سەید کامیل (کامیلشا)[1] کوڕی سەید عەبدولحەکیم (شایحەکیم یا شاحەکیم)، ساڵی ١٢٨٢ی هەتاوی (١٩٠٣ی. ز) لە دێی زەنبیل لە دایک بووە و لە تەمەنی ٩ ساڵییەوە خراوەتە بەر خوێندن. سەرەتا لە

[1] ڕەنگە گەورەترین و بەرچاوترین خاڵی درەوشاوەی بنەماڵەی شێخانی زەنبیل، ئەوە بێ کە زیاتر لە هەموو هاوشانەکانی خۆیان لە تەریقەتدا، چوونە نێو دڵی خەڵک و تێکەڵاویان بوون و خۆیان لێ هەڵنەبواردوون. ئەو سەردەمە کە ئاغا و خان و بەگ بە خەڵکدا ڕاشکاون، شێخ ئەگەرچی بۆ پلەی دنیایی نەگەیشتوونە شانی ئەوان، بەڵام خانەدانێکی وەکوو شێخانی زەنبیل ئەوەندە خۆشەویست و جێگای ڕێز بوون کە بە بەرچاوی خەڵکەوە بەرز ڕێستاون و لەم سۆنگەیەوە بە «شا» ناودێر کراون. ئەم سەرناوەش لە سەید عەبدولحەکیمەوە داکەوتووە و بۆتەی «شایحەکیم یان شاحەکیم»؛ پاشان ئەم سەرناوە گوێزراوەتەوە و لەگەڵ ناوی چەند کەسی دیکەیان تێکەڵاو بووە، وەکوو: حاجی سەید محەمەد نووڕانی «شاینووڕانی»، سەید کامیل ئیمامی «کامیلشا» و سەید عەلی کوڕی گەورە و جێگرەوەی سەیدی زەنبیل کە بە «عەلیشا» ناسراوە.

خزمەت «مەلا مەحموود»ی ناسراو بە «مەلاڕەشە» سیپارە و دەرسە فارسی و عەرەبییەکانی ئەو سەردەمەی لە زەنبیل خوێندووە. دوای دوو ساڵ لەگەڵ کاکی (سەید محەمەد نوورانی)، چوونە دێی جەمیان و بوونە فەقێی حوجرەی مەرحوومی حاجی بابەشێخی مامیان و دوو ساڵێک لەوێ ماونەوە. ئەمجار چوونە ئاوایی تورجان و لە لای خودالێخۆشبوو مامۆستا مەلا سادقی «واسیقوبیللا» درێژەیان بە خوێندن داوە و ساڵ و نیوێکیش لەوێ بوون. پاش بڕینی ئەم قۆناخە، سەید کامیل لە خزمەت مامۆستا مەلا عەولای فەهیمی، ناسراو بە «مەلای دەرزیوەلی= خەلیفەی کانیسێو» درێژە بە خوێندن دەدا؛ بەڵام هێندەی پێناچێ کە مامۆستا کۆچوباری تێکدەنێ و لە زەنبیل دەڕوا و سەید کامیلیش بۆ ماوەی ساڵێک بێ دەرس و دەور دەمێنێتەوە.

لە گەرمەی تێپەڕینی ڕۆژگاردا، سەید کامیل لەگەڵ کاک هەباسی حەقیقی دەبێتە دۆست و ئاشنا و ئەو کاتەی کە حەقیقی لە «قوڵقوڵە» و «ئیسکیبەغدا» فەقێ دەبێ، وای دادەنێن کە زۆربەی ڕۆژانی سێشەممە و هەینی کە جەنگەی پشوودانی فەقێیان بووە، چاویان بە یەکتری بکەوێ. بەکورتی حەقیقی و سەید کامیل بۆ دیدارتازەکردنەوەیان گونداوگوند ڕۆیشتوون و زەنبیل و جەمیان و قوڵقوڵە و ئیسکیبەغدای دراوسێیان بە گەوی زنجیری خۆشەویستی تێکخستۆتەوە.

شەو دێ و ڕۆژ دەبێتەوە و چەرخی زەمانە وا دەسووڕێ کە ساڵی ۱۳۰۷ی هەتاوی (۱۹۲۸ی. ز)، کامیل و حەقیقی پێکەوە بارگەوبنەیان دەگوێزنەوە و دەچنە گەورەدێی «باخچە»ی سەر بە شاری مەهاباد و لە خزمەت مامۆستا مەلا سەید عەبدولکەریمی مودەڕڕیس، شان لە خوێندن شل دەکەنەوە. ئاوا ئاواتی سەید کامیل وەدیدێ کە خوداخودای بوو، ڕۆژێک هەلێکی وای بۆ بڕەخسێ و

لە شــوێنێک بتــوانێ شــان بە شــانی حەقیقــی بــڕوا و ســەر وەبەر پەسارێکی حەسانەوە بێنێ.

وەکوو ئاشکرایە گەرای شێعر لە دەروونی ئەم دوو ئاواڵەدا وا دەگــوورێ کە دەبێــتە هەوێنــی ژیــان و پێکەوەمانیــان. ورتەورتــی فـــەقێیان و زەنازەنــای دەروونــی خۆیــان و بەرچــاوی ڕوونیــان بە ڕاوکەی شێعر دادەنێن و هەل و هاتی مەیدانی کەلام لە کیس نادەن. ئەوەنــدەی بۆیــان کــراوە شــێعریان گوتــووە و بــۆ یەکتریــان خوێندۆتـــەوە و بە دەســتەواش لە تــاریف و پێداهەڵـدانی یەکتــر ڕانەوەســتاون. ســەید کامیــل دەڵــێ: «مەگەر لە خەودا، دەنــا هەر مووشەرعێن و شەڕەشێعر و گاڵتە و گۆرانی و شادمانی بوو. دڵمــان ئەوەندە خۆش بوو هەر دەرسێکی دەمانخوێند، خێرایەکی لە بەرمان دەکرد و مامۆستا زۆرمان لێ ڕازی بوو؛ هەروەهــا ئــێمەش بە تەواوی لەو ژیان و پێکەوە بوونەمان ڕازی بووین. کورد گوتەنی سەد بریــا هەر ئەودەم مردبام، چونکە نە لە پێش‌دا خۆشــیی وام دیبــوو، نە لە دواییش‌دا تووشی هاتمەوە؛ بەڵام ئەو سەردەمە خۆشە تەنیا ســاڵێک بوو، وەک باخچەیەکی پڕ گوڵ لە مەزرای کەس‌نەکێڵ و بەردەڕەقی ژیانمدا.»

پـــاش تێپەڕینــی ئەم مــاوەیە و داهـــاتنی ســـاڵی ١٣٠٩ی.هـ (١٩٣٠ی.ز)، سەید کامیل لە بەر نەخۆشــی و بنــاوبڕبوونی بــاوکی، دەست لە خوێندن هەڵدەگرێ و بەرەو بــاو دەبێــتەوە. ســاڵی ١٣١٠ دەبێتە زاوای خەلیفە مەلا عەلی عایلی و هاجەرە خاتوونی کچی ئەم خواناسە عالم و عارفەی بۆ دەخوازن. خەلــیفە مەلا عەلــی یەکێــک بــووە لە خەلـــیفە دیــار و ناوبەدەرەوەکــانی حـــاجی ســـەید عەبــدولکەریم و وەک شەنگەســوارێکی بــواری شــێعر و ئەدەبــی سەردەمی خۆشی ناسراوە و خەڵکی دێی «چاخلوو» یا «چاغرلوو»ی بەشی بەگزادەی سەقز بووە. ساڵی ١٣١١ (١٩٣٢) یەکەم بەرهەمــی

ئەم زەماوەندە پێ‌دەنێتە جەغزی ژیان و بە «زبێدە» نـاودێر دەکـرێ. ئەم زبێدە خـاتوونە سـاڵی ١٣٣٦ (١٩٥٧) دەدرێ بە حەسـەن‌ئاغای کوڕی شێخ ئەحمەدی «حیسام‌قـازی»ی «سـریلاوا» و سـەرەنجام لە رێکەوتی ١٣٨٩/١/٢٢ لە شاری بۆکان دەچێتەوە بەر دڵۆوانی خودا.

ساڵی ١٣١٤ (١٩٣٥) خودا کۆرپەیەکی دیـکە بە کامیل‌شـا عەتـا دەکا و ناوی دەنێ «تاهیر». سەید تاهیر پاش ئەوەی بووژەڵە دەبێ و دەخوێنێ و پێ‌دەگا، لە هەموو بـابەتێکەوە بە پیـاوێکی هەڵکەوتـوو دادەندرێ. لە کـۆڕی ڕوون و چراخـانی بنەمـاڵەی‌دا دەکەوێـتە نێـو مەیدانی ئەدەب و عیرفـان و بە بـاری ئەخـلاق و ئاکـاری لەبـاری پیـــاوانە و نیشـــتمان‌پەروەری و گەل‌خۆشەویســـتی‌دا دەکەوێ و هەنگاوی پتەو دادەنێ. هەر لە تەمەنی لاوەتی‌دا بازی نێو بـازوبردی ئاڵقەی عیرفان لە سەر شانی دەنیشێ و لای ئوستاد و مـامی خـۆی حاجی سەید محەمەد نـوورانی (سـەیدی زەنبیـل) دەبێـتە تۆبەکـار. هاوکات لەگەڵ ئەو سەردەمە دەچێتە نێو کۆڕی یارانی سوێندخۆری ڕێگای ڕزگاربوونی گەلەکەی و دواتر ماوەی پتـر لە سـاڵێک دەڕوا بۆ کوردستانی گەرمێن و پاش گەڕانەوەی چەند مانگێـک دەگیـرێ. بەپێی تێپەڕینی زەمان و بەرنەدانی ڕێبـازی نەتەوەیـی، سـاڵی ١٣٥٠ (١٩٧١) بۆ ماوەی ساڵێک تووشی زیندان دەبێـتەوە. ئەوجـار مـامی مورشیدی دەیکاتە خەلیفە و دەینێرێتە گونـدی «وەڵێـو»ی نـاوچەی گـەورکی سەردەشـت. پـاش چەنـد سـاڵێک ڕوودەکـاتە شـاردەیی ڕەبەت و بە کاروبـاری خانەقـا و تەریـقەتەوە سـەرگەرم دەبـێ و سەرەنجام ڕێکەوتـی ١٣٨١/٧/١٧ (٢٠٠٢ ی.ز) لەو شـوێنە وەفـات دەکا و هەر لەوێش دەنێژرێ.

ساڵی ١٣١٨ (١٩٣٩) خودا کـوڕێکی دیـکەش بە سـەید کامیـل دەبەخشێ، بەڵام پێنج ساڵێکی پتر پێ‌ناچێ کە خودا ئەو کوڕەی بـۆ

خـۆی دەبـاتەوە. پـاش قەدەرعەیـامێکی دوور سـەرلەنوێ هـاجەرە خـاتوونی خێزانـی، کـوڕێکی دیـکە لە داوێنـی بەر دەبێـتەوە و بە «جەعـــفەر» نـــاودێر دەکـــرێ. ئەو توولەنەمـــامەی دوێنـــێ و ئەم سەختەدارەی ئەمڕۆ، منـی نووسـەرەوەی ئەم پێشـەکییەم کە پێـی‌دا دەڕۆنە خـوار و ڕەنـگە تێـی‌دا تووشـی پـێچ و گەوەی نـاخۆش و تاقەتپڕووکێنیش ببن. جا ئێستا دەبێ بڵێم سـاڵی ١٣٣٢ خـودا دوو کچی دووانە بە سەید کامیل دەبەخشـێ، بەڵام سـاڵانی ٣٤ و ٣٥ بە نەخۆشیی کەوتوویی دەمردن و دەبـنە پێشـباری قیـامەتی دایـک و بابیان.

ساڵی ١٣١٢، سەید کامیل لە سەر دەستووری باوکی دەبێتە زاوای سەیدانی «ماوەڵۆ»یە و سـەیدزادە مەنـیج دەخـوازێ و سـاڵی ١٣١٥ کچێکی لێی دەبێ بە ناوی «ئایشێ» خوشکە گەورەی مـنە و ئێسـتا کە ئەم دێڕانە دەنووسم، هەر مـاوە و لە شـاری سـەقز سـەرمان بە سەری یەکەوە ناوە و وەک دایک، منی ژێـر بـاڵی خـۆی گرتـووە. سەیدزادە مەنیج ساڵی ١٣٦٣ وەفاتی کردووە و هەتا لە بیرمە با بڵێم کە سەیدزادە ئایشـێی خوشـکم، خێزانـی حـاجی کـاکە مـحەمەدی عایلی، کوڕی خەلیفە مەلا عەلیی خەزووری ئاوات بوو، کە ئەویش چەند ساڵێکە بەرەو دەرگانەی هەق گەڕاوەتەوە.

ساڵی ١٣٢٣ (١٩٤٤) سەید کامیل خەجیجە خاتوونی کچی مـام عەزیزی حاجی، خەڵکی دێی گەردیگلان مارە دەکا و لە جەنـگەی ڕۆژانی گواستنەوەی‌دا ڕووداوێک دەقەومێ کە گێـڕانەوەکەی جێـی سەرنج و سەرسووڕمانە. سەید کامیل قەولی داوە و قەراری دانـاوە ڕۆژێکی دیاریکراو وەکوو «سێشەممە» بووک بگوێزێتەوە، بەڵام بە هــۆی پەیــدا بــوونی ڕەشــبگیریی ســەربازی، وڵات تەقوڕەوی

تێدەکەوێ و پیاوانی حکوومەت هەر کەسێکی وەبەردەستیان دەکەوێ، دەیگرن و ڕاپێچی دەدەن و دەیانبەن. سەید کامیل هەودای کارانی لێهاڵۆز دەبێ و دەکەویتە پێوشوێنی گیراوەکان و دەرباز کردنیان. ئەم هەرا و هاوارە زۆری پێدەچێ و سەید کامیل ناتوانێ ڕۆژی دیاریکراوی ژنهێنانی بگەڕێتەوە ماڵ. لەو کاتەدا هاجەرە خاتوونی خێزانی دەکەویتە دەستوپێی کەیخوداکان و خەڵکی نێو دێ کۆ دەکاتەوە و نان و چێشتی زەماوەند دەڕازێنێتەوە و پاش نان خواردنی شەوێ، برازاوا دەنێرێ و بە ئاویتە و چراتۆڕ بووک دەگوێزێتەوە. خەڵک لێی دەپرسن هاجەرە خاتوون بۆ وا دەکەی؟ ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: «سەید کامیل پیاوێکی ماقووڵە و قەولی دابوو ئەوشۆ بووکەکەی بگوێزێتەوە و ئێستاش کە کاروباری لە شاری تەواو نەبووە و نەیتوانیوە بێتەوە و قەولەکەی بەرێتە سەرێ، من ناهێڵم وەعدەبەخیلافدەرچێ...» وەختایەک دوای چەند ڕۆژان کاروباری ڕادەپەڕێنێ و دێتەوە گەردیگلان، تەماشا دەکا ئەوە بووکی بۆ دابەزیوە و پڵاویش خوراوە. هەم زۆری پێ ڕووداوێکی سەیر و بێوێنە دەبێ و هەم زۆریش لای هاجەرە خاتوونی خێزانی کۆنی بە خۆیدا دەشکێتەوە کە ژنی بە سەر هێناوە. سێ مانگێکی پتر پێناچێ کە لەو خاتوونە جیا دەبێتەوە و ئاو بە ئاگردا دەکرێ. ماوەیەکی دیکەی وای پێنـاچێ کە دیسان سەید کامیل تێهەڵدەچێتەوە و ئایشێ خاتوونی کچی سۆقی «حەبیب»ی گەردیگلان دەخوازێ و هێندە لەگەڵ ئەویش ناسازێ و ژنەی چوارەمی بەرەو ماڵی باوان دەبێتەوە.

پێویست بە وەبیر هێنانەوەیە کە سەید کامیل پاش وەفاتی باوکی، ساڵی ١٣١٣ (١٩٣٤) دەچێتە ئاشی چۆمی زەنبیل[1] و ساڵێک لەوێ نیشتەجێ دەبێ. پاشان بە شێوەیەکی ڕەسمی لەگەڵ کاکی، یانی سەیدی زەنبیل، ماڵ جودا دەکەنەوە. حاجی سەیدی کاکی زۆر دەست‌ودڵاوا بووە و لە ملک‌وماڵ دابەش‌کردن‌دا دێیەکی کەم‌داهاتی وەک زەنبیل و خانەقایەکی ڕەق‌وڕووت بۆ خۆی دادەنێ و سێ دانگەی گەردیگلانی دراوسێی زەنبیل کە مولکێکی ئاوەدان و بەداهات و زەوی‌وزار بووە، دەدا بە سەید کامیل و لە ساڵی ١٣١٥ بەولاوە لەوێ بنەگردەبێ.

### ئاوات و سیاسەت

دەڵێن هەر لە منداڵییەوە هەستی بە کۆیلەتی و ژێردەستیی گەلەکەی و پێخوست‌کرانی نیشتمانەکەی کردووە و ئەوەی بۆ بۆتە هەوێنی ژیان و سەربەند و بن‌بەندی شێعرەکانی. هەر لەو سەردەمانەوە بە زمان و قەڵەم و هەڵوێست، وەک مرۆیەکی سیاسی خەریکی کاروباری نهێنی و هان‌دان و ڕوون‌کردنەوەی خەڵک و

---

[1] گوندی زەنبیل مەزرا و قوپی و مێشەیەکی هەیە کە بەشێکە لە مولکی ئەو دێیە. لە بەرەوەی لە سەر چۆمە، لە زۆر زووەوە بەنداوی بۆ هەڵبەستراوە و جێگایەکی بەراو و خاوەن داهات بووە و لەبەر بەشێک لەو ئاوەش‌دا، جۆگەیەکی ئاشگێڕ هەڵبەستراوە و ئاشێکی لێ سازکراوە. ئەم کارە وای کردووە کە ئاشی چۆمی زەنبیل ناوبانگی بڕوا. هەر لە کۆنیشەوە کوورەخانەیەکی لێ‌دروست‌کراوە کە خشتی کاڵی لێ سوورکراوەتەوە و گردی سەرووی بەنداوەکە پێی دەڵێن تەپکی کوورەخانە. لەو سەردەمانەدا کە ئاو زۆر بووە، برینجیان لێ‌کردووە و وەک دەڵێن هەم برینجەکەی زۆر باش بووە و هەم زۆریشی بڕیوە و بڕشتی چاک بووە. دیارە لە بەر ئاش و کوورەخانە و کشت‌وکاڵ جێگایەکی ئاوەدان بووە و سەید کامیلیش لە پەنا ماڵان چەند چاوە خانوویەکی پێکەوە ناوە و ماوەی ساڵێکی لێ ژیاوە.

دەوروبەر و بـاوەڕپێکراوانی خـۆی بـووە و هەمیشـە بە پیـاوێکی نیشتمانپەروەر و تێکۆشەر ناسراوە.

ساڵانی ٢١-٢٤ی هەتاوی (١٩٤٢-١٩٤٥ی.ز) لەگەڵ گـوورزان و سـەرهەڵدان و تەنیـنەوەی «کـۆمەڵەی ژ.ک»، دەبێـتە ئەنـدام و سوێندخۆری ڕێگای ڕزگاریی گەلەکەی و بە ئاشکرا و نهێنـی وەک چالاک و هەڵسووڕاوی ئەم ڕێبازە، هەنگاو دەنێ. زۆر ویـدەچێ کە نازناوی «زرنگ» لە چەند شێعرێکی‌دا ناوی نهێنـی و بـاربووکراوی کۆمەڵەی ژ.ک بێ، چونکە هەرکـام لە ئەنـدامانی چـالاکی کـۆمەڵە دەبـوو بـۆ شـوێنەونکە، خـاوەنی نـاوێکی نهێنـی بووبـان.[1] دوای کـوێرکرانەوەی کـۆمەڵەی ژ.ک، سـەید کامیـل دەسـت لە خەبـات هەڵناگرێ و ساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥) پێشـەوا قـازی مـحەمەد دەیکـاتە بەرپرسـی سیاسـی و نیزامـی و "سـەدری کـومیتەی گەردیگـلان و ناوچە". ساڵی ١٣٢٥ی هەتاوی، پـاش جـوانەمەرگبـوونی کۆمـار، وەک تەواوی تێکۆشــەران و خەباتکـارانی ئەو ڕێگـایە دەگیـرێ و ماوەی دوو ساڵێک لە زیندانەکانی بۆکان، سەقز، مەهابـاد، ورمـێ و قەزویـێـن‌دا دەمێنێـتەوە. دوای ئـازار و دەرد و مەرەدێکـی زۆر و قوتـاربوون لە کـوژران و خنکـان، سـاڵی ١٣٢٧ (١٩٤٨) ئــازاد دەکرێ و دێتەوە ماڵێکی ساردوسڕ و بێ‌نان و ئاو. دیـارە لە مـاوەی گیرانەکەی‌دا بەخێوکرانی ماڵ و منداڵی، دەکەوێتە سەر شانی حاجی سەید محەممەد نوورانیی کاکی و ناهێڵێ کەمایەسی ببینن.

ئەم هەل‌ومەرجە نالەبارەی ژیان وا دەکـا کە ئیتـر سـەید کامیـل خۆی بۆ ناگیرێتەوە و دەکەوێتە کۆچاوکۆچ و گەرمـێن و کوێسـتان

---

[1] سیبەری ئازادی، هەوراز و نشیوەکانی مێژووی خەباتی کۆمەڵەی ژ.ک، ١٣٢١-١٣٢٤، کەمال عەبدوڵلاهی، سلێمانی، بنکەی ژین، لاپەڕەی ٢٤١. (کاک کەمـال نووسـیویەتی «زرینگ»، بەڵام بەپێی شێعرێکی کە لێرەدا هاتووە «زرنگ»ە)

کـــردن، بەڵام لە بـــاری بیـــر و بـــاوەڕەوە نـــاگۆڕێ و هـــیچ چاوســـــوورکردنەوەیەک نایشـــەمزێنێ و دەســـــت لە ڕێبـــازی ئازادیخوازانەی هەڵناگرێ. جا هەربۆیە ساواک چـاوی دووسـەری پێی هەڵنایە و هەمیشە گوێقوڵاغی وەدووەدەخا. هەرکـات شـێعرێکی نیشـتمانی و بەرچاوڕوونـانەی لـێ بڵاودەبـۆوە و دەکەوتە زار و زمانان، خێرایەکی دەگەیشتنە سەری و هەڵیاندەپێچا و ئەویش دەبوو بە پینەوپەڕۆ و هێنانەوەی شێروڕێوی، خۆی دەرباز بکا یـان دەبـوو ماوەیەکی زۆر قاچاغ و لەخۆوریا و شەوبەکێو بووبا.

گومانم نییە کە سەید کامیل وەکـوو زۆربەی ئـاواڵە پتەوەکـانی، هەتا ئەو ڕۆژەی ژیا، لە سەر سوێندەکەی کۆمەڵەی ژ.ک ڕۆیشت و وەفادار بوو بە ئامـانجە بەرزەکـانی. هەرگیـز کـۆڵی‌نەدا و بە پیـری دەیگوت:

تەمەنی من لە ساڵی سـی و دوو بـوو[1]
ئـــاگری ســـەربەخۆیی گەل هەڵبـــوو
نەکـــوژاوە گەیشـــتە حەفتـــا ســـاڵ
تەمەنـــم، ئەی عەزیـــزی کیـــژ و کـــاڵ
ئێســـــتەکەش وا دەزانـــــم هەر لاوم
هەر لە ســـەر بیـــر و بـــاوەڕم مـــاوم
یـــا بە ئـــاواتی خـــۆمەوە دەمـــرم
یـــا نە، ئـــاوات لە باوەشـــم دەگـــرم

---

[1] بەم پێیە دەبێ مەبەستی سەید کامیل بۆ چەند سـاڵێک بەر لە دامەزرانـی کـۆمەڵەی ژ.ک و کۆمار بێ.

## هەڵكرانی ئاڵا لە گەردیگلان

بەپێـــی دەقـــی ژمــارە ٥٥ی ڕۆژنـــامەی كوردســـتان، لاپەڕە ٣-٤ (١٣٢٥/٣/١٨ ـ ١٩٤٦/٦/٩)، بە بۆنەی هەڵكرانی ئاڵای كوردستان لە گەردیگــلان، ڕێوڕەســـمێک بەڕێـــوەدەچێ كە ئــێمەش دەقەكەی كوردستان بڵاو دەكەینەوە. هەرچی لە دەقەكە زیاد كرابێ خـراوەتە نێو قولاپەوە و تەنیا بە باری ڕێنووس‌دا گۆڕانی بە سـەردا هـاتووە. تێبینی لە سەر شێعرەكە كراوەتە پەراوێز.

هەڵكردنی ئاڵای موقەددەس لە كومیتەی محەللیی گەردیگلان

ڕۆژی ١٣٢٥/٣/٩ لە حوزووری ژمارێكی زۆر لە مـالكین و زانایـان و سادات و موحتەرەمین و جووتێر و زەحمەت‌كێشان كە ژمارەیـان بە ٦٠٠ كەس گەیشتبوو، ئاڵای موقەددەسـی كوردسـتان كە لە لایەن حەزرەتــی پێشـــەواڕا بــۆ كــومیتەی نــاوبراو بە خەڵات نــاردرابوو، پێشــوازییەكی یــــەكجار شــایان كــراوە و بە ســروودی میللـــی خوێندنەوە و دەسڕێژی تفەنگان و گــاوگەردوون ئــاڵای مـوقەددەس وارید و لە سەربانی كومیتەی محەللیی گەردیگلان چەقێنـدراوە. لە كاتی ڕووبەڕوو بوون بە ئاڵای موقەددەس، سەدری كومیتەی نێوبراو ئاغای سەید كامیل لە ئەسپ دابەزی و بەم جۆرەی خەتاب بە ئاڵای موقەددەس كرد: بەخێر بێی ئەی سەمەری زەحمەت‌كێشانی ڕێگای ئازادی! بەخێر بێی ئەی مایەی سەربەرزیی نەتەوەی كـورد! بەخێـر بێی ئەی گوڵی باغی كوردستان و چقڵی چاوی دوژمنان! [پاشان] لە لایەن ئاغــای ســەید عەبــدولعەزیز ســەیادەت، مەلا عەبدولمەجیـد مودەڕڕیسی تورجان، مەلا سەید عەزیزی شیلاناوی [و] خەلـیفە مەلا عەلــی [عــایلی]، چەنــد وتــارێكی گەرم‌وگــوڕ خوێنــدرایەوە و ئەم شــێعرانەی ژێــرەوەش لە لایەن ئاغــای ســەید كامیــل، ســەدری كومیتەی [گەردیگلانەوە] ئیراد كرا:

لەو پارچە سێ ڕەنگەی وەک باڵی هومای ئاڵا
هەودایەکی لێ بۆوە، فەوری لە ملم ئاڵا[1]
ئەو ڕشتەیە تا مەحشەر، مەحکەم لە ملمدایە
کێشامیە ژێر سایەی، ئێستێکە بەبێ پەروا[2]
پەروام نییە تا مردن، لەو وەختەوە دیتوومە
گرتوومەتە ئامێزم، هەر زاڵەیەتی بەدخوا
ئەو دارە چ دارێکە؟ تیری جگەری دوژمن
بڕوانە بە شاباڵی، چەن زاڵە بە سەر زاڵا
ئەو حاسڵە پێم وایە، گەنمم یەک و سەد دەبڕێ
بەو دوو گوڵە گەنمانە، وا دیارە لە ڕووی ئاڵا[3]
نووکی قەڵەمی یەعنی، بینووسە لەبۆ دوژمن
بەو ڕۆژە لە ڕووی ئاڵا، مەعلوومە کە لێت قەوما[4]
تەعریفی نییە ئاڵا، ئاڵایەکی ڕەنگینە
سوور و سپیی و سەوزە، ڕۆح حازرە بۆ سەودا
کاڵایەکی پڕ قیمەت، بۆ میللەتی کوردستان
نرخی بەدەر و زیادە، ئەمڕۆ لە سەر و ماڵا

---

[1] لە دەقە سەرەکییەکەدا بە هەڵە نووسراوە: هەودایکی لێ بوو....

[2] لە دەقەکەدا نووسراوە: کێشامییە ژێر سایەی ئێستا بەبێ پەروا. ئەمەش هەڵەی تێدا نییە، بەڵام دواتر شاعیر خۆی گۆڕیویەتی.

[3] لە دەقەکەدا هاتووە:

ئەم حاسڵە پێموایە یەک سەد دەبڕێ گەنمم
ئەو دوو گوڵە گەنمانەی وا دیارە لە ڕووی ئاڵا

میسرەعی یەکەم مانای تەواوە، بەڵام دواتر سەید کامیل ڕێکتری کردووە. میسرەعی دووەم، هەڵەی چاپی تێدایە و «بەو» دروستە نەک «ئەو».

[4] لە دەقەکەدا نووسراوە: بۆ ڕۆژی لە ڕووی ئاڵا مەعلوومە کە لێت قەوما بێگومان هەڵەی چاپە و «بەو» دروستە نەک «بۆ».

هەر جێگەیێ ڕووی تێکا، دەیکا بە گوڵ و گوڵشـەن
دوژمن کە ئەوەی بینی، وەک جوو خمی لـێ شـێوا
ئەمـڕۆکە لە گەردیگـلان ڕۆژێـکە کە کوردسـتان
نەیـدیوە هەتـا ئیسـتا حاسـڵ لە سـەری سـاڵا
ئەی کاکی "زرنگ" شێعرت، پاکی وەکوو قەنـد وایە
تیفلـی دڵـی کوردسـتان، بـۆی هەر لە گوڕوگـاڵا
تـۆ هـاتی بە سـەر هـاتم، بـۆ زیـارەتی بـاڵاکەت
وا نـووکی قەڵەم نووسـی، تـاریفی قەد و بـاڵا

## کۆچاوکۆچ

هەروەک پێشتر باس‌کرا، سەید کامیل پاش دوو ساڵێک زیندانی، ساڵی ١٣٢٧ی هەتـاوی ئـازاددەکرێ، بەڵام کە دێـتەوە بە سـەر خەزنەی بەتاڵ و هەواری خاڵی‌دا دەکەوێ و مـاڵێکی ڕەق‌وڕووتـی بۆ دەمێنێتەوە. بۆ ئەوەی دەستی بکرێتەوە، ئەو سـێ دانـگە ملـکەی گەردیگلان کە بوویەتی دەیـدا بە گونـدی جەمیـان و لەگەڵ مـامی دەیگۆڕێتەوە و لە بـاقی‌دا مێگەلەمەڕێکیش وەردەگـرێتەوە و مـاڵی دەچـێ بـۆ وێ. بە کـورتی و کـوردی، پـاش ئەوەی سـەوداکەی سەردەگرێ و کاروباری تەواو دەبێ و دەکەویتە پێ‌وشوێنی سەنەدی دێـی جەمیـان، بـۆی جێ‌بەجـێ نـابێ و لەبەر ئـابڕووی خـۆی و بنەماڵەی دەنگ ناکا و بە داری دەستی دەچێتەوە زەنبیـل و لە مـاڵی کاکی پەنادەگرێ. دوای ساڵێک بەشـێک لە مەڕەکـانی دەفرۆشـی و گوندی «کانی‌بەن»ی سەر بە گەورکی میرەدێی سەقز دەکڕێ و ماڵی دەگوێزێتەوە بۆ ئەو شوێنە. سـاڵێک دواتـر «کـانی‌بەن» دەگـۆڕێتەوە لەگەڵ دێـی «شـێخ‌چۆپان» هەر لەو نـاوچەیە و هەتـا سـاڵی ١٣٣٣ (١٩٥٤) کە دەیفرۆشێ لەوێ دەبێ. پاش فرۆشتنی شێخ‌چۆپان، سێ

دانگی دیی «قاقلاوا»ی دراوسێی زەنبیل لە کەسێکی خۆی دەکڕێ و بارگەوبنەی دەبا و هەتا ئاخری تەمەنی لەوێ دەمێنێتەوە. سەید کامیل ئەمجارەشیان سەوداکەی چاک دەرناچێ و پاش ماوەیەک بۆی ڕوون دەبێتەوە کە ئەوەی کرێویەتی مولکی ئەوقافە و ئاوا، دەستی لە بنی هەنبانەوە دێتەدەر. ئەمجارەش لەبەر پاراستنی حورمەتی بنەماڵە، بێدەنگەی لێ دەکا. ئیتر بە هەژاری و کەموکووڕی و دەسکورتی و کشتوکاڵێکی نەمرنەژی دەیگوزەرێنێ و لە هەوراز و لێژەکانی ژیانیدا خۆی نادۆڕێنێ.

کامیل شا هەتا ساڵی ١٣٦٨ لە قاقلاوا دەبێ، بەڵام نەخۆشی تینی بۆ دێنێ و دێتە ماڵی سەید تاهیری کوڕە گەورەی لە شاری سەقز و بە داودەرمان و پزیشکەوە دەخافڵێ. نەخۆشی و مانەوەی گرێوگۆڵەکانی دەروونی و وەدی نەهاتنی ئاواتەکانی سایە بە سایەی دێن و سەرەنجام ڕۆژی ١٣٦٨/٦/٥ (١٩٨٩) لە شاری سەقز دڵی پڕ تین و تاوی لە لێدان دەکەوێ. کۆچی سەید کامیلی نامراد، حەشیمەتێکی بێوێنە وەجۆش دێنێ و وەک شەپۆل تەرمی تامەزرۆی عیشق و ئاواتی کوردایەتی بەرەو زەنبیل دەبەن و لە «مەرقەدان» ئەسپاردەی خودا و خاکی نیشتمانەکەی دەکەن.

## تایبەتمەندییەکانی دیکەی سەید کامیل

ئاواتی شاعیر، پیاوێکی میوانگر، سەروروخۆش، سوارچاک، ڕاوچی و ئەنگێوە بوو. ئەوەندە میوانگر و نان و ماڵ خۆش و بەخوڵک و دەرگاکراوە بوو، کە ئەگەر ڕۆژێکی میوانی نەبووبا، بە ژیانی دانەدەنا و وەڕەز دەبوو. هێندەی پێ تێکدەچوو کە ماڵ و منداڵ خۆیان لێکەناردەگرت و وەپەنایان دەکەوتن. ئەگەر هەر نەبووبا، مەلای ئاوەدانی و چەند کەسێکی دیکەی بانگدەکردن و نانی لەگەڵ دەخواردن و ئۆخژنی دەگەیشتە دڵ و دەروونی. هەمیشە

کوتــوویەتی: «ماڵێــک میــوان ڕووی تێ‌نەکــا یــا خــوا بە ســەر خاوەنەکەی‌دا وێران بێ.»

بــۆ سەرورڕووخۆشــی و ڕەزاســووکی، بە قەولــی کــوردی کەس تای‌نەدەکرد و لە پیر، پیر و لە جەوان، جەوان بــوو. بە ئــادەمیزادی مرچ‌ومۆن و ڕەزاتاڵەوە کەیفی دەژاکا و هەولــی‌دەدا نــوقڵی کــۆڕ و کۆبوونەوان بێ.

وەختایەک باسی یەکسم و چارەوێ و سواری و سوارچاکی دێتە گۆڕێ، پێش هەموو کەس لە موکریان سەید کامیل دێتە بەر زەین و نەزەری هاوچەرخەکانی. ئەم شۆڕەســوارە تاقــانەیەی ئەو مەڵبەنــدە، بەم‌جۆرەی لێ دەگێڕنەوە، لە شــوێنی دوور و نیــزیکەوە چارەوێیــان هێناوە بۆ لای، هەتا ڕایــانبینێ و فێــری غــار و قــۆرتە و وێــرغە و قەدەم و مقەستەیان بکا بۆ ئەوەی سوار بتــوانێ تەقــڵە و جلیــت و ڕمبازییان‌پێ‌بکا. ئەوەندەی ژیاوە، هەمیشە ئەسپ و مایێنی ڕەســەن و باشی بووە و هەلــی ڕاو و ڕکێــف و مامزەکوتــانی لە کــیس نەداوە. سەبارەت بە سەردەمی تین‌وگوڕی دەورانی پێشووی دەڵێ:

ئەو کــاتە جحێڵــی تونــدوتۆڵ بــووم
ڕاوچی کەوی کێو و شیو و دۆڵ بــووم
ســــوارچاکی وڵاتــــی کــــوردەواری
مــن بــووم بە تەنــێ، لە دێ، لە شــاری
سوارێک نەبوو بــێ و بڵــێ منــیش هەم
ســــوارچاکم و تەقڵەبــــاز و بــــێ‌خەم
هەرخۆم بە تەنێ جلیت بە دەس بــووم
خاوەن گوڕوتین و هێــز و هەس بــووم

لە ئەنگێوەییش‌دا ئەوەندە دەست‌ڕاست و بڕوابەخۆ بووە کە زۆر جاران گرەوی بردۆتەوە و دەنگی داوەتەوە.

ئاوات لە بواری ئایین و خواپەرستیش‌دا هەرچەند زۆر ویشک نەبوو، بەڵام هەم ئەهلی دین بوو، هەم ئەهلی عیرفان. بە پارێزگاری و لەخواترسی دەژیا و خۆی لە هەڵە و پەڵەی زەمانە دەپاراست. وەک موسوڵمانێکی بێ گرێ و سەرڕاست و سروشتی هەرگیز خۆی بە دینەوە نەدەنواند و لە دەرگای کەرەمی خودا، خۆی بە کەترەخەم و دەردەدار دەزانی و هانای بۆ دەبرد و دەیکوت:

خودا! بۆچی منی بێچارە بێدەرد و بەڵا ناکەی؟
ئیلاهی! بۆچی دەردی من بە ڕەحمی خۆت دەوا ناکەی؟
شەوێ تا بەربەیان یاڕەب، تەمادارم لە دەرکی تۆ
لەبەرچی من بە خاسانت شەوێکی ئاشنا ناکەی؟
ئەگەرچی زۆر گوناکار و هەڵەم، ئەمما ئەتۆ یاڕەب
کەریمی و جەزام لێناستێنی، کاری وا ناکەی!
فەقیر و دەستەوئەژنۆم و ئەتۆ کانی کەرەم، ڕەببی!
دەزانم فەرقی خاوەن تاج و تەختێک و گەدا ناکەی
دڵی هەر بۆیە خۆشە "کامیلی" بێدەست و پێ، ئێستێ
کە فەرقی ڕۆستەم و پیاوێکی وا بێدەستوپا ناکەی

بەڵام وەکوو پێشتریش باسی کرا، هەستی کوردایەتی و ئازادیخوازییەکەی بە سەر هەموو لایەنێکی‌دا سواربووە و هاوسەنگی هەموو تایبەتمەندییەکانی هاتۆتەوە و بە پێویستی نازانم چی دیکەی درێژە بدەمێ، چونکە لە خودی شێعرەکانی‌دا تەواو ڕەنگی داوەتەوە. ئەوەی ڕاستی بێ، خۆ دەکرا بەر لەوەی بچمە نێو بەشێک لەو بابەتانەی پێشوو، زووتر باسی هەست و هونەر و هۆنراوەکانی بێنمە گۆڕ، بەڵام وام بە باش زانی سەرەتا ڕابردووی سەرلەبەری ژیانی بە کورتی و لە نووکەوە بێنم و هەمووی یەکلایی بکەمەوە، جا پاشان بابدەمەوە سەر ئەو خاڵە درەوشاوەی کە زیاتری پێوە ناسراوە.

## سەید کامیل و سەرەتای گۆڕانی بیری شاعیرانەی

بۆخۆی دەڵێ هەرکە سەوادم پەیداکرد یا سەوادمبۆوە، شێعرم پێخۆش بوو. لە سەرەتاوە لە دانیشتنی خۆمانە و نێو حوجرەی فەقێیان و کۆڕی شێعر و ئەدەبدا، باب و مام و کەسوکارە خوێندەوارەکەم، کە هەموویان ئەهلی شێعر و ئەدەبیات بوون، چونکە دەمتوانی شێعری شاعیرە فارس و کوردەکان بە ڕێکوپێکی بخوێنمەوە، ئەگەر لەوێش نەبووبام، بەدوایانداردەناردم و شێعریان پێدەخوێندمەوە و دەیانگوت تێکی نادا و باشی دەخوێنێتەوە. هەر ئەودەم هەر شێعرێکم پێخۆشبووبا، بە باشی دەمنووسییەوە و زوو لە بەرم دەکرد. دایمودەرهەم هەوا و سەودای وەزن و قافیە و ئاهەنگی شێعرم لە دڵدا دەگەڕا. دواتر وا دیارە هەر بەوانەوە ڕانەوەستام و ڕازی نەبووم و لاقم لە بەڕەی خۆم پتر ڕاکێشا و هەڵمکوتایە سەر شێعر کوتن. هەر لەو سەردەمانەوە ئیتر نەمپساندۆتەوە و دەستم لێ هەڵنەگرتووە.

کەوایە سەید کامیل نەمامی شێعرەکانی لە نێو جەغزی دین و ئەوین و تافی لاویدا دەگووڕێ و دەکەوێتە ڕیزەی شاعیرانی سەردەمی خۆی لە موکریان. کامیل لە شێعرەکانیدا چەند نازناوێکی هێناون کە بریتین لە «زرنگ، ئاوات، ئیمامی و کامیل» وەکوو پێشتریش باسمکرد واوێدەچێ کە «زرنگ» نازناوی «کۆمەڵەی ژ.ک»ی بووبێ و کەوتبێتە نێو شێعرەکانی.

## شێوازی شێعریی سەید کامیل (ئاوات)

ئاوات لە هەموو قالب و چوارچێوەیەکی وەکوو غەزەل، قەسیدە، مەسنەوی، دووبەیتی و چیوچیدا شێعری هۆنیوەتەوە؛ بەڵام وەکوو ئاشکرایە تای تەرازووی غەزەلەکانی سەنگینترن و دەکرێ بڵێی غەزەلبێژ بووە.

شێوەی کارەکانیشی ڕەنگ و بۆنی نالی و مەحوییان پێوەیە و سێبەری کەلامی حاجی قادری کۆیی و دواتر مەلا مارف و سەیفولقوزات کاریان تێکردووە. ئەگەر کەسێک سەرگوریشتەشی نەزانێ، بە خوێندنەوەی شێعرەکانی دەزانێ کێیە و دەکەوێتە پاڵ کام پۆلە شاعیری نیشتمانەوە.

ئاوات بابەتی شیعری زۆرن، بەڵام ئەوانەی دیار و بەرچاون، هەم ڕەخنەی کۆمەڵایەتین و هەم بە هەوێنی بیری ئازادیخوازانە دەستاودراونەوە. ڕاستە سروشتپەسندی و لاڵانەوەی ئەویندارانە و ئایینی دەبنە بەشی زۆری شێعرەکانی، بەڵام کامیل کاتێک گوڵدەکا کە دەمی وەکوو گوڵ دەپشکوێ بۆ پێداهەڵدانی وڵاتەکەی و کەلامی دەبێتە پۆلووی ئاگر بۆ گیانی خەنیمانی نیشتمانی.

ئاوات لە دەربڕینی هەست و سۆزی ڕزگاریخوازانەیدا زۆر جاران لە جەنگەی تاریکی و نووتەکیی سەردەمی ڕەشی پاشایەتیدا، پەنای بردۆتە بەر سەمبولەکان و بۆ نموونە، گەلی بە مەلێکی وەکوو کەو شوبهاندووە یان وشەیەکی وەکوو «شەو»ی بە تێل و بەندی دەسەڵات داناوە.

ئاوات لە زماندا شاعیرێکی ڕەوانبێژە و هەتەڵۆکە و مەتەڵۆکەی لە خەڵک دانەهێناوە و هەر ئەوەش وای کردووە کە لەچاو شاعیرانی هاوتەمەنی، زۆرترین شێعری بکرێتە بەستە و گۆرانی.

### فەوتانی زۆربەی شێعرەکانی

وەکوو ئاشکرایە و پێویستە باسی بکرێ، لە زەمانی دەسەڵاتی پێشووشدا خوێندن و نووسین بە زمانی کوردی قەدەغە بوو؛ ئەگەر کتێب یا نووسراوەیەک ـ جا با سیاسیش نەبوایە ـ بەڵام مادام ئەوەی کە کوردی بوو، دەرکەوتن و ئاشکرا بوونی، گیران و لێدان و تەنانەت کوژرانیشی بە دواوە بوو.

ئەم هەڵومەرجە تاڵ و دژوارە وای کردبوو کە ئاواتیش وەکوو هاوبیرانی دیکەی ئەوەندەی بۆی کرابا بەرهەمەکانی دەشاردەوە و بنعەرزیدەکردن. جا لەبەرەوەی عادەتی وا بوو کە بە جەوهەر دەینووسی، ئەوانەی بن گڵ کرابوون یا کەلیناوکەلێنیان پێکرابوو، وا پاک ببوونەوە کە ساغ نەبنەوە و بۆمان نەچنەوە سەر یەک. بەڕاستی ئەگەر هۆنراوەکانی ببێینە تای تەرازوو، تا قورسەکەی نەماوە و سەری تێداچووە. ئێستاش جاروبار و لێرولەوێ هێندێک بەرهەمی لە کەسانێکی دڵسۆزەوە دەکەونە دەست کە لای بنەماڵە نەماون.

دەردی سەرباری هەموو دەردان و ڕزین و فەوتانی زۆربەی هۆنراوەکانی، ڕووداوێکی دڵتەزێنە لە ساڵی ١٣٤٦دا. ڕۆژێک کە سەید کامیل و هیچکام لە ئێمە کوڕەکانی لە ماڵەوە نەبووین، پیاوەکانی ساواک دەچن و دەوری ماڵەکەی دەگرن. پیاوێکی بەوەفای سەید کامیل کە دەزانێ گەلەکەی ناسکە و ڕەنگە کتێب و دەفتەر و نووسراوەکانی ببنە خەنیمی گیانی خاوەنماڵ، خێرایەکی خۆ بە ژوورەکەی سەید کامیلدا دەکا و گورجێکی هەموویان کۆ دەکاتەوە. لەو کاتەدا تەندوور گڕەمشقەڵانی دەبێ و ئەویش لەو جەنگە تەنگەتاوییەدا چی پێشکنایە غەیری ئەوەی بیانبا و بیانکاتە دەستەچیلەی ئاگر و ئاوا ویشک و تەڕی پێکەوە دەسووتێ. ئەمەش خەسارێکی گەورەی بێگەڕانەوە بوو کە تازە ماریجەی نەدەهات و نەشهات. ئاوات دوای ئەوەی دەگاتەوە و بە ڕووداوەکە دەزانێ، چی پێنامێنێ غەیری ئەوەی بڵێ هەی دەستی شکاوم و تازە هەزار هاواریش بە پووڵێکە.

### ئاوات و شاعیرانی هاوچەرخی

ئاوات لەگەڵ تێکڕای شاعیرانی هاوچەرخی خۆی لە موکریان نێوانی زۆر خۆش بووە و لەگەڵ زۆر کەسیان شێعری گۆڕیوەتەو، بەڵام بەداخەوە زۆربەیان نەماون. مامۆستایانی گەورەی وەک

هـێمن و هەژار بە مامۆستا ناویان بردووە، ئەگەرچی ڕەنگە لە بەر ئەوەش بـووبێ کە لەوان بەتەمەنتـر بـووە و وێـدەچێ پتـر ڕەنگـی خۆشەویستیی لێ نیشتبێ. مامهەژار کورتەوتـارێکی لە سـەر چـاپی هەوەڵی دیـوانەکەی نووسـیوە کە بە دوای ئەم پێشـەکییەدا هـاتووە. لەگەڵ مامۆستایان خاڵەمین، هێدی و میرزا محەمەدی نووری نامەی شێعرییان پێکەوە ئاڵوگۆڕ کردوون. لەگەڵ خوالێخۆشـبوو مامۆسـتا مەلا غەفووری دەبباغی زۆر دۆست بووە؛ پێی وا بوو ئەگەر چاوی بووبا، ڕەنگە کەس بە شێعر دەرەقەتی نەهاتبـا و تـۆزی نەشـکاندبا. دۆستایەتی لەگەڵ مامۆستا مەلا کەریمـی ساردەکۆسـتانی (ڕاوچـی) یەکێکی دیـکە لەو پەیوەنـدییانە بـوو کە خـۆی بە دۆسـتایەتییەکی ڕاستەقینە و نەپساوەی دادەنا.

لەوانە بتـرازێ، سـەید کامیـل لە هەمـوو کەس زیـاتر هـۆگری مامۆستا حەقیقی بوو، چونکە لە هەرەتی مێرمنـداڵی و باوخۆشـیڕا پێکەوە ببوونە ئاواڵەفەقێ و ئـاواڵشـاعیر و یەکجـار گەرموگـوڕ و یەکدڵ و یەکزمان بـوون. نـامەگۆڕینەوەی مـابەینی ئەم دووانە لە هەمـوو شـاعیرانی دیـکەی هاوسـەردەمی زیـاترە. چەن نـامەیەکی شاعیرانەی لەگەڵ ئاغا سەید قادری سەیادەتی ئامۆزای گۆڕیـوەتەوە کە نیشانەی خۆشەویستییان پێوە دیارە.

سەید کامیل نێوانی لەگەڵ شاعیران و نووسەرانی کەمتەمەنتـر لە خۆشی یەکجار خۆش بووە و هەودای درێژی تەمەن ئەم ڕێگـایەی لێ نەتەنیوە و دەتـوانین باسـی کـاک سـەلاحەددین ئاشـتی، کـاک ئەحمەد مەولانی، کاک سەعید نەججاری (ئاسۆ) و کاک ڕەسـووڵی کەریمی (سووتاو) بکەین. ئەم کەسانە بەپێی پلەی خۆشەویسـتی و نیزیکایەتیی ڕوحی، هەرکام سەریان داوە و ئەوەندەی بۆیـان کـراوە پێیانلێنەبڕیوە. بەتایبەت کاک سەلاحەددینی ئاشتی هەر ئەوەنـدەی هەلێکی بۆ هەڵکەوتبا، لە دێی قاقڵاوا یان لە هەر شارێک کە سـەید کامیـل سـەفەری بـۆ دەکـرد، خـۆی دەگەیانـدە لای و ڕادەی

نێوانخۆشـییان لە شـێعرگۆڕینەوەیاندا چـاکی ڕەنـگ داوەتەوە و پێویست بە شیکردنەوەی من ناکا. لەگەڵ کاک «سوارە»ش نێوانیـان وەک مام و برازایەک زۆر خۆش بـووە و شـێعریان گۆڕیـوەتەوە و هەمیشە دەیگوت هەر بە تەنیا سوارە جوانەمەرگە و کەسی تر.

**چاپی دیوانی ئاوات**

سـاڵی ١٣٦٥ی هەتـاوی (١٩٨٦)، دیـوانی ئـاوات بە هەوڵ و تێکۆشانی کاک سەید نەجمەددینی ئەنیسی، لە چاپخانەی مەهارەتی تاران چاپکرا، بەڵام بەڕاستی لە بـاری ڕێنـووس و هەڵەبڕکـرانەوە یەکجار کۆڵەوار بوو. هەر ئەوەندە بوو چاپ کرابوو، دەنـا هیچکـام لەو کارانەی کە دەبێ لەگەڵ چـاپی بەرهەمێـک بکـرێ، وەبەرچـاو نەگیرابوو؛ کەچی دیسانیش ماڵی ئـاوا بـێ کە تـوانی ئەم هەنگـاوە باوێ و ئاوات چاوی بە دیوانە چاپکراوەکەی ڕوون بێتەوە.

کاک نەجمەددین جارێکی دیکە و ساڵی ١٣٨١ سـەرلەنوێ هەر بەو شکڵ و شێوەیەی پێشـوو دیـوانەکە چـاپ دەکـاتەوە کە تەنیـا ڕووبەرگەکەی دەگۆڕێ و بەڕاستی ئەمجارەیـان جێگـای ڕەخـنە و هەڵبەزینەوەیە، چونکە زۆر جاران گرێوگۆڵ و گرفتەکانی خرابوونە بەرچـاو و بە گـوێیدا درابـۆوە. ئەم جـارەی دووهەم ڕەهـرەو لە مەهاباد چاپی کردووە. جاری سێهەمیش ساڵی ١٣٨٧ ڕەهرەو چـاپی کردۆتەوە و هەر کاری کاک نەجمەددینە و وەک جارەکانی پێشـوو هەر بە ناپوختی بڵاوکراوەتەوە.

خوێنەری خۆشەویست! ئەوەی ڕاستی بـێ مـن وەکـوو کـوڕی سەید کامیل هێندەم گلە و گازندە هاتەوە سەرێ و گـوێم پڕکـرا لە پرتەوبۆڵەی هەق و بەجێ، کە سەبارەت بە چاپی دیوانەکەی، قـۆڵم هەڵماڵی و وێکەوتم و ئەوەندەی بۆم کـرا کەوتـمە گـوڵچنینەوە و دۆزیـنەوە و کۆکردنەوە و کرۆکاشـی شـێعرەکانی. پـاش ئەم کـارە هاتم و لەم ڕێگا سەختە و هەڵەمووتەدا، بەرۆکی کاک «حەمەدەمینی شاسەنەم»م گرت و ئەویش بەوپەڕی لەسەرەخۆیی و ڕۆحسـووکی

ئەرکی نووسینەوە و دیسان و دیسان نووسینەوە و بەسەردادانەوە و ڕاستکردنەوەی وەئەستۆ گرت و پرتەوبۆڵە و بروبیانووی هەڵەگرانی بە ڕووخۆشی وەرگرت و ڕەچاوی کردن. لەگەڵ سپاس و پێزانینی زۆر لە خودا دەخوازم بۆ خزمەت بە فەرهەنگ و زمانەکەمان هەر ساغ و تەمەندرێژ بێ. دواتر هانام بردە بەر دوو خۆشەویستی باوەڕپێکراوی ئاوات، زانا و کارزان و کارناس و کارجوان و وردبین و نەوەستاو و دایمەکار و جێیمتمانەی هەمووان: بەڕێزان کاک «ئەحمەدی مەولانی» و کاک «سەلاحەددینی ئاشتی» کە هەردووکیان زۆر بە خۆشی و خۆشحاڵییەوە ئەرکەکانیان وەئەستۆگرت و لە هەوەڵەوە تا ئاخر بەبێ وەڕەزی و ماندووبوون و وەستان لە سڕینەوە و ساغکردنەوەی هەڵەوپەڵەکانی چاپەکانی پێشوورا بگرە (کە ئەو بەشە پرزەحمەتترین و دەستگرترین بەش بوو؛ لەوانەیە بڵێم نزیکەی ساڵێکی خایاند) تا ڕێکوپێککردن و هەڵەگرتن و چەند جاران بەوردی پێداچوونەوە و دەرخستنی بناغەی زۆر بابەت و ڕازاندنەوە و هەموو لایەنی کاروبارەکە بە سەر شانی ئەوانەوە بووە. دەستیان خۆش بێ و کوڕیان نەمرێ و خودا ڕاوەستاویان کا.

جا بۆیە هەر جێگایەکتان پێ باش بوو ڕەحمەتبووی ئەوان بکەن و لە هەر کوێش تووشی هەڵەوپەڵە و گنجولۆچ و خواروخێچی هاتن، ئەوە لە سەر شانی منی بنووسن، چونکی لە هەموو بێنەوبەرە و خواروژووری کارەکاندا گوێی منیش بە دەست ئەو دوو بەڕێزەوە بووە و تەمەنیشم لە هەردووکیان زیاترە و دیارە خەتی خوار دەبێ لە ژێر سەری کێدا بێ!

سەید جەعفەری ئیمامزەنبیلی
(٢٠١٣/٧/٢٨) ١٣٩٢/٥/٦

# بۆچوونی مامۆستا هەژار

برای هونەردۆست و خـاوەن‌مرخ کـاکە نەجمەددیـن ئەنیسـی ـ خوا بە ئەدەبیاتی کوردی بهێڵێ ـ ڕۆژێک وەک فریشتەی بەخـت و هات لە کەرەج کە بۆ من وەک چزیرگەیەکی چۆڵوهۆل وایە پەیدا بوو، دیوانی شێعری کاکە سەید «کامیلی» لە بن باخەڵدا بوو، کە لێی بڕوانم و بیروڕای خۆمی لە سەر دەربڕم، قسێکی سـەیر بـوو، منـی هەژار بیر و بڕوام لە سەر چاکی و خراپی شـێعری سـەید «کامیـل» دەربڕم، چی بە سەر چییەوە؟

باوەڕ کە وەک بە شوانێکی شارەزووی دنیا نەدیو بڵێی دا تۆخـوا دەربارەی نالی و مەولەوی تاوەگۆزی، بیروڕای خۆت دەربڕە. بەڵام چۆن دەڵێم نـا؟ هەلێکـی وا باشـم بـۆ هەڵـکەوێ کە مـن کـۆمەڵە هەڵبەستی «کامیل‌شا» کە عومرێکە بە ئاواتی دیتنیانم، دەستی داوە و دەتوانم بە ڕاشکاوی بیان‌خوێنمەوە، چۆن لە دەست خۆمی ئەدەم ... مەسەلی کوردییە دەڵێن «تـا نەسـیمێک نەبـێ هەژارێـک بە ئـاوات ناگات.»

سەرت نەیەشێنم، ئەو بۆی جێ‌هێشتم و من شانم لێ‌داخسـت و سەرلەبەرم خوێندەوە، یان دەبێ بڵێم شەو و ڕۆژێکی ڕەبەق لە نـاو بەهەشتێک‌دا ژیام کە سۆفی و دەروێشـیش هەر بە ئـاواتی شـتێکی وان و نایگەنێ.

شێعر و هەڵبەستی «کامیل‌شا» نیازیان بەوە نییە من و سەد مـن و نیومنی وەک من بڵێن باشە، نەخێر عەتر خۆی دەردەخا و پێی ناوێ عەتار بە تەڵاق و سوێندانەوە ڕەش بێتەوە کە عەتری چاکە.

هەرکەس هەروا تۆزقاڵێک بە قەد چاوی مێرووله، مرخی شێعری هەبێ و ئەدەب‌ناس بێ، دەزانێ سەید «کامیل» چۆن پەڕیوەتە سـەر

چلەپۆپە و لە گۆمی ئەدەبیاتی زمانی کورددا چۆن مەلەوانێکی تاقانەیە، بەڵام فزوولی هەڵمدەگرێ لە ناو هەڵبەستەکانی‌دا دەمەوێ بەرانبەرییەک بکەم و بڵێم بەرانبەر بە بیرورِای خۆم فلانەم لە فلانە پێ جوانترە کەچی هەمووشیان لە جوانیدا بێوێنەن.

بە بیرورِای من هیچ بویژێکی کورد وەک کاک کامیل ناتوانێ بەهاری کوردەواری وێنە بگرێ، سەیریش نییە؛ ئەو پیاوە هەموو تەمەنی لە لادێ و لە کوێستانی کوردستان ژیاوە و زەینی زۆر روونە و هەرچی دەیبینێ دەتوانێ لە مێشکیدا بێ‌کەم‌وکەسری، عەنباری بکا و زۆر بە ئامان‌وزامان نیشانمانی بداتەوە.

واتە ئەگەر دەسەڵاتم بوایە، حوکمم لێ دەکرد بە لانی‌کەم هەموو بەهاران سەفەرێکی ناو هەوارچییان بکا و وەکوو مێشەنگوین شیرە لە گوڵان هەڵمژێ و بە هەنگوینی بمان‌داتەوە، بەراستی کەس وای لێ نازانێ؛ ئەمما ئەگەر دەڵێم لەو بارەوە زۆر زەبر بەدەستە، مانای وای نییە کە لە غەزەل و شێعری نیشتمانی‌دا بەجێ‌ماوە، ماڵم قەبرە هەرچی گوتوویە مەحشەری کردووە و خوێندەوارانی ئەدەب‌پەروەر و دوورناس دەزانن کە سەید «کامیل» زۆر شاعیرێکی کەم‌وێنەیە و ئیحتیاجی بە پێداهەڵدانی من نییە ... .

لە خوام تەڵەبە مەرگی نەبینم و لە خوام تەڵەبە بتوانێ پتر ئەدەبیاتی کورد گەشە پێ بدا. ئامین یا رەببەلعالەمین.

شاگردێکی بچووکی سەید کامیل
عەبدوررەحمان «هەژار»
کەرەج ١٣٦٤/٩/١٨

# پاڕانەوە

ڕووڕەشــی دەرگــای خــودام و ســەرفکەندەی موســتەفا
شەرمەســاری ڕۆژی حەشــر و مــل‌کەچی ئــالی عەبــا

چـــارەڕەش، شـــەو تـــا بەیـــانی هەر ئەم‌وئەولا دەکەم
هەروەکـــوو مـــاری برینـــدار هەڵدەســـووڕێم بێ‌ســـەدا

ڕوو لە کوێ کەم یارەبی، چ بکەم لە دەس عیسـیانی زۆر
غەیری دەرگای تــۆ نییــە دەرکــێ کــە ڕەحمــم پــێ بکــا

دێمــە دەرگــاکەت کــە بــۆ چــاک و خــراپ ئــاواڵەیە
کەوڵ و پێســتم ڕادەخەم تــا هەم لــە دنیــای بێ‌وەفــا

هەر ئەوەندەم بەس کــە تــۆم ناســی و لە تــۆ داوا دەکەم
لـێم ببـووری و خـۆش ببـی لـێم و نەسـێنی لـێم جەزا

ڕووم ڕەشە، ئەمما ســەر و ڕیشــم وەکــوو بەفــری ســپی
بەو سەر و ڕیشەم ببەخشــە! نەک بــە ڕووی هێنــدە ســیا

"کامیـــل"ە نێـــوم، بەڵام نـــاقیس لـــە دونیـــا مـــامەوە
چونکە بێ‌مەیلـی ئەتـۆم زۆر کـرد، هەتـا تـوانیم خـودا!

**قاقڵاوا، ١٣٦٢ی هەتاوی**

---

بحر: رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# جەژنی ئێمە*

وەک دەڵێن ئازاد بووە سەد شوکر کاک سەید مستەفا
بۆیە دنیا پڕبووە ئەورۆ لە دڵخۆشی و سەفا

جەژنی ئێمە بوو بە دوو ئەوساڵ بە لوتفی کردگار
با لە دڵ دەرکەین خەم و حەسرەت هەموو جەور و جەفا

با وەخەڕبین شوکری یەزدانی مەزن بێنینە جێ
بوغز و کینە لابەرین و بێینە سەر سیدق و سەفا

هەر شەو و ڕۆژێک هەزار شوکری خودا هێشتا کەمە
چۆن بکەین ئێمە بە جارێک و بە سەد جار ئیکتیفا

هەر لە ئێستاوە هەتا دەمرین بڵێین یارەب شوکور
هەر ئەوە ئەو، خاوەنی لوتف و عەتا، میهر و وەفا

قاقڵاوا، ۱۳۶۴ی هەتاوی

---

* بۆ ئازادبوونی حاجی سەید مستەفا سەیادەت، ئامۆزای ئاوات لە زیندان
بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# هات بەهار

هات بەهار، هێنـای بە بـار تـۆوی گـوڵ و موشـکی خەتـا
سەوز و سوور بوو، خوار و ژوور و چیمەن و دەشت و چیا

دووڕزەنـــی هەوری بەهـــار و ڕنـــوە بەفـــری بەنـــدەنێ
لێـک بەرانـبەر بـوون وەکـوو لەشـکر لە عەرزی تـا سـەما

دای بە سەر بەفـرا شـەبەیخوون، بـوو بە ئـاردی نێـو دڕوو
داینەوانـــد پشـــتی کلـــیلە، ڕایڕفانـــد مەئمـــووری بـــا

هەر هەرەس بـوو، لەشـکری زسـتان لە ترسـان هەڵـوەری
دیـارە قەڵغـانی سـەهۆڵ بـوو، دوێ ئەویـش پشـتی شـکا

تـــاوڵی ســـەوزی لە جێـــی بەفـــری ســـپی هەڵـــدا بەهـــار
چـــوونە پێشـــوازی، گرووهـــی سوێســـنە و هەڵـــز و کەمـــا

چەهـــچەهەی بولبـول وەکـوو مـووزیکە بـۆ سـانی گـوڵان
فیتەفیتـــی شـــوانە، ســـووتی ئەفســـەری تیـــپ و ســـوپا

لەم ســـوپا و تیـــپ و قشـــوونەی شـــای بەهـــار هێنـــاویە
شـــۆقی ڕۆژ نـــوورئەفکەنە جارجـــار لە نـــاو هەورووهەڵا

سوێســـن و شـــەوبۆ و نێـــرگس، شەشـــپەڕ و گوڵئاتەشـــی
پـــاکی پشـــکووتن، بـــووە دونیـــا بە یەک حەشـــروحەلا

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

بولبـــولە زاوا و گـــوڵ وەک بـــووک و دڵ هەروەک دەڵاڵ
دێ و دەچـــێ بۆیـــان، بەخـــۆڕایی، بەبـــێ مـــاف و بەهـــا

کورکەکـــورکی تەیـــرە دێ شـــەو، یـــانە سـۆزی ســینەمە؟!
ئەم هەرا و بەزمە بەهـــــارە، یـــــانە پەردەی ســـــینەما؟!

وا ڕەقیبـــیش دەرپەڕی، جـــووتەی لە بـــا دا، تـــا بڵـــێن
ئەی لە بەر ئەم خۆشـــییە، حەتتـــا کەریـــش ترســـی نەمـــا

حەقیەتـــــی ئەو گوێـــــدرێژە هەڵپەڕێـــــت و دەرپەڕێ
هەر لە ئینســـان تـــا جەنـــابی کەر یەکـــێ برســـی نەمـــا

هەرکەســـێ خـــاوەنی دڵ و گـــوڵ بـــوو ئەوا چـــوو بـــۆ گەڕان
کەس نەمـــا، پیـــر و جەوان، چـــاک و خـــراپ، شـــێخ و مەلا

ئەی ســـەبا! خـــۆ تـــۆ دەڵـــێن پەیکێکـــی تونـــد و خۆشـــڕەوی
هەســـــتە، پیـــــاوانە بـــــڕۆ لای یـــــاری بێمیهـــــر و وەفـــــا

پێـــی بڵـــێ هەســـتێ لە خەو، خـــونچە هەمـــوو پشـــکووتووە
بێتە دەر، تـــا ســـەر لە بەر خـــۆی نـــێ وەکـــوو چـــاوی حەیـــا

بولبـــول و دڵ بـــۆ گـــوڵان، ئەو هەڵفـــڕی، ئەم دەرپەڕی
هەڵفـــــڕینە، دەرپەڕیـــــنە، پێکەنیـــــنە، "کـــــامیلا"

**گەردیگلان،١٣٢٩ی هەتاوی**

## بەهار هاتەوە

بەهـــار هـــاتەوە، گـــوڵ دەبـــن پەیـــدا
چـــیمەن، ســـەوزایی، ئەو بـــڕوا پێیـــدا

تـــۆوی دڵەکەی خـــۆم هەڵگـــرت بـــۆ ئەو
لـــە مەڵبەنـــدی وی چانـــدم لـــە ڕێـــدا

گوڵاڵەســـــــوورە بێتـــــــە پێشـــــــوازی
بـــا لێـــی بپرســـێ مەیلـــی بـــە کـــێ دا؟

هەروەک دڵ دەچـــێ: ســـوور و خوێنـــاوی
بـــۆ پێشـــواز باشـــە، بـــۆی بـــووە شـــەیدا

زەنبیل، ١٣١٢ی هەتاوی

---

بحر متقارب مثمن اثلم (هجایی): فعلن فعولن// فعلن فعولن

# زستانێ شێخچۆپان

زمهەریرێــک بــوو بــە نێــو زســتان و هــات و ڕابــرا
عــالەمێکی بــرد لەگەڵ خــۆی، تــا چــووە چــاڵی فەنــا

کـــردەوە و پاشـــماوەکەی ئەو، بـــۆگەنی لاشـــەی وڵاخ
شـــوێن و ئاســـاری گـــلاوی هـــیچ لـــە مـــاڵێدا نەمـــا

خیگــە هەڵچــۆڕا لــە چەوری، ئــارد لــە کەنــدوو بۆتــە تــۆز
ماســـت و دۆ، کەشــک و پەنیــر، تــۆزێ نەمــابوو بــۆ دەوا

قووتی دا زستان هەچــی بــوو، قــووتی حەیــوان و بەشــەر
کــا لــە کــادێن بــوو قوتــار و گیــا لــە قۆریــە و گیشــەدا

جەرگ و دڵ ڕەش بــوو لەتــاو بێســوختیی و دار و ڕەژی
بوو سپی چاومان لــە حەســرەت تــام و بــۆنی قەنــد و چــا

خشخشەی گرت کەڵ لە سەرمان، مرد لە برسان بزن و کار
لاڕەشـــە گەیـــە وڵاغ و گـــوێڕەپەی گـــرت جوانەگـــا

کەر لـــە ســـەرمانا هەڵیکێشـــاوە گـــوێی و هـــاتە دەر
چوو دەگەڵ گوێکورتی ئەحمەق کەوت و لێک بوونــە بــرا

هــاتە دەر لاشـــەی مەڕومـــاڵ، بێژومـــار و بێحیســـاب
ســەگ لــە خۆشیخۆشــییا ڕێــک کەوتنــە خۆشــی و ســەما

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

گۆشـــــتیان نەخـــــورا لە بەر لاوازی و ئەســــپێ و گەنە
پێســـــتیان نەکـــرا بـــە وەســـڵە، دەســـتی وێـــکەوت و دڕا

"لالەشوان" لاڵ بوو لە کێو و "کاکەریم" کوێر بـوو لـە ماڵ
ئـەو لـە تەنـدوور بۆتـە تـاجۆ، ئەو لـە کەژ هـاوار ئەکـا

هـات بەهـار، ئەممـا لـە پـاش بارانـە بۆچیمـە کەپەنـک!
یـا لە پـاش مـردن چ سـوودێکی هەیـە ئـاوی بەقـا؟

هـات بەهـار، ئەممـا بەهـاری هێنـدە پـڕ سـەیر و سـەفا
نەبـــوە قەت، نەیـــدیوە کەس لەم دەورەدا، نەشبیســـــترا

شێخچۆپان، ١٣٣٢ی هەتاوی

# بای وادە

ئەی شنەی خۆشـی بەهـار، بـای وادە! هەر تـۆی شـارەزا
بـۆ کەژ و کۆسـار و دەشـت و لـووتکەیی بەرزی چیـا

چـاوەڕێ بـووم زوو نەهـاتی، بـۆ نەهـاتیم بـوو مەگەر؟
لارەمـل بـووم وەک وەنەوشـە، ئـاخری ئەسـتۆم شـکا

چـاوی خـۆم هێنـدە بڕیبـوو مـن لە ڕێگـای هاتنـت
هەروەکـوو نێـرگس لـە بـاغ و گوڵشـەنا چـاوم ڕوا

گیانەکەم! چابوو کـە هـاتی، وەک هەناسـەی مـن نەبـووی
ساردوسـڕ، بێخێـر و بێقـازانج و ئامـانج و سـەفا

وا شـوکور ئەورۆ شـنەت هـات و گەشـاوە مێرغـوزار
داغـدارە بەفـر و لێـی قەومـا هەرەس، پشـتی شـکا

ئەی نەسـیمی بەربەیانانـت وشـەی ژینـی نـوێ!
ئەی کـزەی خۆشـت حەکیمـی حـازیقی دەرد و بەڵا!

بـۆ گـوڵ و گـوڵزار و بـاغ و چـیمەن و دەشـتی وڵات
تـۆی دەبەخشـی دیـمەن و تـۆی مـایەیی نەشـوونوما

داری گـوڵ، سـەرو و چنـار و لالەزار و نـارەوەن
ڕێـک لـە خۆشـی تـۆ ئەوا کەوتوونـە هەڵپەڕکـێ و سـەما

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

لالـە و نەسـرین و گـوڵ، سـونبول، وەنەوشـە و یاسـەمەن
نێـرگس و شـەوبۆ هەمـوو پـڕ غونچـە و بەرگ و گەڵا

کوندەبوو خوێندی لـە شـاخ و بولبـول و قـومری لـە بـاخ
هەریەکـێ هـاوار ئەکـا: وا بـا خەڵات پەخشـان ئەکـا

کانیـاو تـۆقین لـە بـن‌بەرد و خـڕیش پـڕ بـوون لـە ئـاو
مێـرگ و دەشـتودەر ژیـاوە، بۆتـە یەک حەشـرو‌حەلا

ڕێـک وەدەرکەوتـن کوڕوکـاڵ، کیـژ و لاو، پیـر و جـوان
دەس لە نـاو دەسـتان، بـە هەڵپەڕکـێ ڕەفیـق و ئاشـنا

کەس نەمـا ئەمـڕۆ لـە شـار و دێ، هەمـوو چوونـە دەرێ
هەر "ئیمـامی" مـا لـە مـاڵێ بێ‌سـەلا وو بێ‌سـەدا

قاقڵاوا، ۱۳۵۰ی هەتاوی

# ئامۆژگاری

تـۆ لەگەڵ هـاواڵ بەمـۆڵەت بـە، هەتـا بـتکەن بـە شـا
زەڕڕەپەروەر بـە، هەتـا بـتکەن بـە ڕۆژی ڕووی سـەما

عەیبی خەڵکی قەت مەبینە، هەر سەرنج دە عەیبی خۆت
تـاوەکوو عەیبـت بپۆشـن، گیانـە غەیـرە و ئاشـنا

ئەرخەیـان بـە، غەیبەتـی تـۆش هەر دەکـا لێـرولەوێ
غەیبەتـی هەرکەس لە لای تـۆ هەر کەسـێ بێتـوو بکـا

باسـی ناموسـی کەسـێ ناکـا بـە مەعلـوومی ئەوەی
گەر بەنـاموس بـێ، لـە دونیـادا مرۆیانـە ژیـا

هەرکەسـت دی کەوتـووە، دەسـتی گرە هەسـتێتەوە
تـاوەکوو پاشـان ببێتـە پشـتیوانی وەک بـرا

هەرکەسێ لێـت قەڵسـە، چـاوم! پێکەنـە، ئـابڕووی بەرە
تـووڕەیی لەم عەسـرەدا هەمبانەیێکـە پـڕ لـە بـا

وەک "ئیمـامی" بـە، کـە غەیـر و ئاشـنا لێـی ڕازیـیە
چونکە قەت نەیکرد بە عومری سیرڕی خەڵکی ئاشکرا

گەردیگلان، ۱۳۲۲ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# نێرگسی مەست*

نێرگسی مەستی ئەو کە وا سەیری گوڵ و چەمەن دەکا
کایە بە سوێسن و گوڵ و شۆخی بە یاسەمەن دەکا

دڵ لە شکەنجی زولفی ئەو لانەیی کردووە قەدیم
مەنعی مەکە شەوانە گەر مەیلی وەلای وەتەن دەکا

چونکە شکاوە شووشەکەی، پاکی ڕژاوە ئابڕووی
بۆیە موشەووەشە و قسەی زولفی شکەنشکەن دەکا

قەددی بڵند و شووشی ئەو تەعنە لە سەروی باغ ئەدا
جیلوەیی پرجەماڵی ئەو ڕەخنە لە ڕۆح و تەن دەکا

تەبعی مەلوولی "کامیل"ت، کاکە چلۆن دەگا بە تۆ
شەشدەری بەستراوە ئەو، ئارەزوویی کەفەن دەکا

شێخچۆڕیان، ١٣٣٢ی هەتاوی

---

* نامە بۆ خزمەت کاکی، "حاجی سەید موحەممەد نوورانی"
بحر رجز مثمن مطوی مخبون: مفتعلن مفاعلن مفتعلن مفاعلن

# ئاڵا

لەو پـارچە سـێ ڕەنـگەی وەک بـاڵی هومـای ئـاڵا
هەودایەکــی لــێ بــۆوە، فەوری لە ملــم ئــاڵا

ئەو ڕشــتەیە تــا مەحشــەر، مەحــکەم لە ملــمدایە
کێشــامیە ژێــر ســایەی، ئێســتێکە بەبــێ پەروا

پەروام نیــیە تــا مــردن، لەو وەخــتەوە دیتــوومە
گرتــوومەتە ئــامێزم، هەر زاڵەیەتــی بەدخــوا

ئەو دارە چ دارێــکە؟ تیــری جــگەری دوژمــن
بــڕوانە بە شــاباڵی، چەن زاڵە بە ســەر زاڵا

ئەو حاسـڵە پـێم وایە، گەنمـم یەک و سـەد دەبـڕێ
بەو دوو گــوڵە گەنمــانە، وا دیــارە لە ڕووی ئــاڵا

نــووکی قەڵەمــی یەعنــی، بینووســە لەبــۆ دوژمــن
بەو ڕۆژە لە ڕووی ئـاڵا، مەعلـوومە کە لێـت قەومـا

تەعریفــی نیــیە ئــاڵا، ئــاڵایەکی ڕەنگیــنە
ســوور و ســپیی و ســەوزە، ڕۆح حـازرە بـۆ سـەودا

کــاڵایەکی پــڕ قــیمەت، بــۆ میللەتــی کوردســتان
نرخــی بەدەر و زیــادە، ئەمــڕۆ لە ســەر و مــاڵا

---

بحر هزج مثمن اخرب: مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن

هەر جێگەیێ ڕووی تێکا دەیکـا بە گـوڵ و گوڵشـەن
دوژمن کە ئەوەی بینی، وەک جـوو خمـی لـێ شـێوا

ئەمـــڕۆکە لە گەردیگـــلان ڕۆژێـــکە کە کوردســـتان
نەیـــدیوە هەتـــا ئێســـتا حاســـڵ لە ســـەری ســـاڵا

ئەی کاکی "زرنگ"![1] شێعرت، پاکی وەکوو قەنـد وایە
تیفلـــی دڵـــی کوردســـتان، بـــۆی هەر لە گوڕوگـــاڵا

تـــۆ هـــاتی بە ســـەر هـــاتم، بـــۆ زیـــارەتی بـــاڵاکەت
وا نـــووکی قەڵەم نووســـــی، تـــــاریفی قەد و بـــــاڵا

**سەرچاوە: ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە٥٥، ١٣٢٤ی هەتاوی،**
**بە بۆنەی هەڵکردنی ئاڵا/ گەردیگلان**

---

١ زرنگ، نازناوی هۆنەر بووە لەو سەردەمەدا.

# بولبولی گوڵزاری ئەدەب*

کــۆچی کــرد بولبــولی گــوڵزاری ئەدەب
دەرکــی بەســراوە هەمــوو شــاری ئەدەب

ڕەونەقــی هــۆنەری کــورردان ڕۆیــی
لەبرەوکەوتـــــووە بـــــازاڕی ئەدەب

کەی بەهــار وا بــوو کە گــوڵ پێنەکەنــێ!
گــوڵ و گیــا بگــری بە ئــازاری ئەدەب

ڕۆیـــی ئەو هێمنـــی زانـــا و بەڕێـــز
مــانگە ئــاوا بــوو لە گۆڤــاری ئەدەب

پیــر و لاو ڕێکــی بە گریــان و دەڵــێن:
داخەکەم ون بـــووە ئاســـاری ئەدەب

خۆشەویســـتی گەل و مامۆســـتا بـــوو
پــاکی ڕەش‌پۆشــە ســەر و خــواری ئەدەب

ڕێ‌کەوت قـــافڵەیی شـــێعر و هـــونەر
وەک دەڵــێن کەوت و نەهــات بــاری ئەدەب

مەنزڵـــی شـــاعیرەکان تاریـــک بـــوو
دەرکـــی بەســـراوە بە بزمـــاری ئەدەب

چــاوی "ئــاوات"ە وەکــوو گــۆمی خــوێن
بــۆ لە قــیس چــوونی کەس‌وکــاری ئەدەب

قاقڵاوا، ١٣٦٥ی هەتاوی

---

* شینی مامۆستا هێمن

بحر رمل مسدس مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلن

# گیانەکەم*

گیانەکەم! چت لێبکەم؟ داخت لە دڵ بۆتە قەڵات
باری خۆی داوە بە عەرزا مەینەت و شادی هەڵات

تۆ دەزانی چم بە سەر هات بەو هەموو دەردانەوە؟
مەنزڵم کوێیە؟ دەبا عەرزت بکەم شوێن بێ لە لات

یا گوزەرگەی عاشقان، یا گیانە مەنزڵگەی دڵان
یا دەنا باخی گوڵان، یاخۆ چیای بەرزی وڵات

لەو چوار جێگایە ڕەنگە شوێنی من باش هەڵگری
چەشنی کەروێشکێ هەزارەم کرد لە ترسی موشکیلات

یار ئەگەر پرسی لە کوێیە "کامیلی" بێچارەکەم؟
پێی بفەرموو: کەسنەکێڵ و بەردەڕەق، بێحاسڵات

قاقڵاوا، ١٣٥٠ی هەتاوی

* بۆ کاکی، "حاجی سەید محەممەد نووڕانی"
بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# قەزات لە من کەوێ*

دوێ نەخـــۆش بـــووی کـــە ئەمـــن هاتمـــە لات
ئەی قەزای تـــۆ لـــە منـــی تاقـــەبرات!

بـــە شـــەو و ڕۆژ لـــە خـــودا دەخـــوازم
لـــە منـــی غەمـــزەدە بـــێ، دەرد و بەڵات

ون نەبـــێ نـــووری جەماڵـــت یـــاخوا!
لـــە مـــن و مەمـــلەکەت و خەڵکـــی وڵات

ســـەروی قەددت کـــە لـــە بۆســـتانی وەفـــا
ئـــاو درا، دوور بـــێ لـــە دەرد و ئافـــات

مەجلیســـت گەرموگـــوڕ و ڕوونـــاک بـــێ
قەت نەکـــووژێتەوە یـــاڕەببی چـــرات!

وەکـــوو پەروانـــە لـــە تـــۆ هـــاڵاوین
هەر ئەتـــۆی خـــاوەنی فەیـــز و بەرەکـــات

کاکـــە، برژۆڵـــی منـــە بۆتـــە گەســـک
پێـــی دەمـــاڵم هەمـــوو خـــاکی دەرگـــات

چونکـــە بۆتـــە کلـــە بـــۆ چـــاوی مـــن
دیـــدە وو مـــاڵ و ســـەرم بـــێ بە فیـــدات

"کامیـــل"ت شـــێت بـــوو کـــە تـــۆی ناســـاز دی
ســـەری خـــۆی نـــاوە، بـــە بێهۆشـــی هەڵات

**قاقڵاوا، ١٣٣٥ی هەتاوی**

---

* دیسان بۆ کاکی

بحر رمل مسدس مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلن

# نەسیمی نەوبەهار

بــە تەڕدەســتی نەســیمی نەوبەهــار هــات
بــە گــورجیش ڕۆیەوە، مــن مــام و ئــاوات

ئەریٚ ئەی ســەروی بــاڵابەرزی خۆشــڕەنگ!
ئەونــــدە بــــۆ لەبــــارە بەژن و بــــاڵات؟!

لە بەر بەرزی، وەبــــــاڵی عاشــــــقانت
نەگەییــە گەردنـــت، هەیهاتـــە هەیهـــات!

بــە دڵســەردی بەجیٚمــاوم لــە هــاوال
چ ســـەرگەرمم بـــە عەشـــقی ئـــاڵوواڵات

دەمــیٚ دڵســەرد و گــا ســەرگەرمی تــۆم مــن
کەچـــی تۆشـــی دەگەڵ مـــن بیٚموبـــاڵات!

لـــە دووری تـــۆ وەکـــوو بولبـــول دەنـــاڵم
بـــە هەڵبەســـت و وتەی خـــۆش و مەقـــاڵات

لـــە شـــەترەنجی خەیاڵـــت بـــازیگەر بـــووم
بــە دەس فیلــی فیراقــت بــووم کــش و مــات

بــە قوربــانی وەفــات بــیٚ، گەرچــی نیــتە
"ئیمــامی" هەر دەڵــیٚ دوور بــی لــە ئافــات

گەردیگلان، ١٣٢٠ی هەتاوی

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# خەڵات

بـــۆ گەلـــی تێکۆشـــەرە ئەورۆکـــە هـــات
هـــاتی هەمـــوو کۆمەڵـــە وا ڕۆژ هەڵات

تینـــی ئەوا دا بـــە هەمـــوو نیشـــتمان
چاکـــە دەبـــووژێتەوە بـــۆ کارەســـات

ســوێند بــە کەســێ هەر بــووە، قەت نــامرێ
هەر ئەوە بێوێنـــە بـــە زات و ســـیفات

مـــوژدە دەبەم بـــۆ گەلـــی ئـــازا و نەبەز
گەل لـــە پەت و بەنـــد و قەنـــارە دەرات

یـــاخۆ ئەگەر پیـــر و لەکارکەوتـــە بـــووی
کـــوا دەس و گۆچانـــت و شـــان و عەبـــات؟

پیـــری، جحێڵـــی، بـــە جەهەنـــنەم! وەرە
بمـــرە لە ڕێـــی پـــڕ دڕوداڵـــی وڵات

یانـــە خەڵاتـــت دەدەنـــێ بێتـــوو مـــای
یـــا کـــە شـــەهید بـــووی، ئەوە چـــاتر خەڵات

قاقڵاوا، ۱۳۴۰ی هەتاوی

---

بحر سریع مسدس مطوی مکشوف: مفتعلن مفعتلن فاعلن

# شاری موحەببەت

باش خەستە وو بێچارە وو ئاوارەیە بابت
چاک شێتی قەد و زولفییە، پەتیارەیە بابت

ترساوە لە ڕەشمـاری وەکوو زولفی درێژی
داییم کە بە فکر و غەمی ئەو مارەیە بابت

نەردی دەگەڵی کرد، لە ئەو ماچ و لەمیش ڕۆح
دۆڕاندی، ئەوا ڕۆحی چوو، بێچارەیە بابت

دایناوە سەری، ڕۆیوە بۆ شاری موحەببەت
چونکە بە خودا شۆهرەیی ئەو شارەیە بابت

**کانی‌یەن، ١٣٣١ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

# تەشریفی دێ یار

فەلەک ناڵێم دەگەڵ من ڕاست بە، هەر کەچڕۆیینە کارت!
بەڵام ئەوشۆ سەبرکە، پێم دەڵێن تەشریفی دێ یارت

ئەگەر مانگ تۆش لە کەل سەر بێنیە دەر تا ڕۆژێ، یارەببی!
بە ڕووزەردی هەڵێی، شۆقی نەمێنێ نووری ڕوخسارت

نەسیمی شەو، ئەتۆش دەنگت نەیێ ئەوشۆکە تا ڕۆژێ!
ئەجەل بگرێ هەناسەت، هەر نەمێنێ شوێن و ئاسارت

کەڵەشێر، تۆش مەخوێنە، بێ‌هەرا و بێ‌دەنگ‌بە ئەوشۆکە!
سەروماڵ پێشکەشی باڵت دەکەم، ڕۆحم فیدای زارت

چرا، تۆش هەڵنەبی، بشکێی و نەوتت لێ‌بڕێ یاخوا!
بەجارێ تێک‌بچی، وا گەر بە سەد وەستا نەکەن چارت

خروس بێ‌دەنگ، نەسیم بێ‌هەست، چرا کووژاوە، مانگ خۆی گرت
کەچی تۆ ئەی فەلەک سەبرت نەکرد، هەر بەد بوو ڕەفتارت!

گەردیگلان، ۱۳۲۲ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# بە سەرت

گیانە، شمشیری برۆت خوێن دەڕژێنێ، بە سەرت!
ڕۆژی ڕووشت بە خودا، دڵ دەچزێنێ، بە سەرت!

من بە هۆی ڕووتەوە هاتم، کەچی شمشیری برۆت
کوشتمی بێخەبەر و کردوویە خوێنێ، بە سەرت!

خوێنی من سوورە، لە سەر کوڵمەتە، مەیشارەوە لێم
لەگەڵ ئەو شیری برۆت کێشە بوو دوێنێ، بە سەرت!

یانی کوڵمت وەکوو ڕۆژە کە بە زولفی ڕەشی خۆت
داینەپۆشی دڵ و جەرگم دەکوڵێنێ، بە سەرت!

بەو هەموو سوێندە کەسی من، بە سەری تۆ، هۆنەر
ئارەزووی بوو کە موحەببەت بنوێنێ، بە سەرت!

گەر دەکێشێ لە منی غەمزەدە شیر، ڕۆژی ڕووت
ونکە، با ئاسوودە بم تاکوو سبەینێ، بە سەرت!

"کامیل" ئەوڕۆ بەکوڵ و جۆشە لە سایەی گوڵی ڕووت
وەکوو بولبول بە خرۆش خۆش دەخوێنێ، بە سەرت!

**قاقڵاوا، ١٣٣٥ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# سەمای سەر

شێواو و پەرێشانم، وەک زولفی پەرێشانت
خەم بوو بە خەمت هەروەک ئەگریجەیی گۆچانت

بیخە ملم و بیبە، ئەم کەللە بە شەق وەک گۆ
با بێتە سەما بۆ تۆ، هەڵسوورێ لە مەیدانت

بۆچیمە سەری بێلەش، بۆچیمە لەشی بێسەر
هەردووک بە فیدای تۆ بن، هەردووکی بە قوربانت

**زەنبیل، ١٣٣٠ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن اخرب: **مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن**

# پاڕانەوە

ڕووم لـــە دەرگاتـــە وەکـــوو ســـائیلی ڕووت
ســـــائیلێکم بـــە خـــودا ڕووت‌وقـــووت

مـــــن و دڵ نیوەشـــــەو و کـــاتی بەیـــان
دێینـــە بەردەرکـــی ئەتـــۆ هەردوو بـــە جـــووت

بـــــە هومێـــــدی کەڕەمێکـــــی زۆریـــــن
لـــە خـــودای وا بـــە جەلال و جەبەڕووت

بـــە نەســـیمی کەڕەمـــت کۆلکەدرەخـــت
تـــازە بـــوو، خـــونچەیی کـــرد و پشـــکووت

پشـــتی مـــن ئاســـنە، پۆلایـــە مەگەر؟!
کـــە لـــە ژێـــر بـــاری گوناهـــا نەبـــزووت

ئیتتیکـــــام ئـــــایەتی «لا تەقنەتـــــوو»ە
ناهومێـــدم مەکـــە بۆخـــۆت فەرمـــووت

ئـــاهی مـــن وەک نەفەســـی ســـوبحدەمە
کەچی هەر هـات و لـە هـیچ کـوێ نەنگـووت

شـــاهیدی حـــاڵی منـــە خـــوێنی دڵـــم
کـــە بە عەینـــی دەتکـــێ وەک یـــاقووت

غەیـــری لای تـــۆ نەبـــێ، ئەم قوربەســـەرە
هـــیچ پەنـــای دی نییـــە، مـــات و مەبهـــووت

**قاقلاوا، ١٣٣٤ی هەتاوی**

---

بحر رمل مسدس مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلن

# پیری لە ناکاو

لەناکـــــاو پیـــــریم لـــــێ وەدەرکەوت
بەختـــیش هەروەکخـــۆم هـــات و لێـــی خەوت

دەرکـــــی نەجـــاتم لـــــێ داخـــــراوە
ڕێــــگەی ڕزگـــاریم ڕێـــک خـــوار و چەوت

ڕۆژی ڕوونـــاکم تاریـــک بـــوو وەک شـــەو
چـــرای ژیـــانم مـــاوە بـــێ نەوت

فتـــیلەی حەیـــات بەحـــاڵ ڕوونـــاکە
هەربینـــا ئەویـــش لـــە ســـووتان کەوت

جێگـــای گەڕانـــم تـــا ســـەر چـــۆمییە
جێـــی دانیشـــتنم دەرگـــای مـــزگەوت

هەیهەی لەم ژینـــــە لەم بەرێچـــــوونە
کەچـــی بەو حـــاڵەش دڵ هەر نەســـرەوت

ئەســـپی تەبـــیعەت هێشـــتا هەر ســـوارە
هەروا بەکـــارە، بەجـــلەو، خۆشـــڕەوت

چوارینـــە و هەڵبەســـت، قەســـیدە و غەزەل
یەک لە دووی یەک دێن، پێنج و شـەش، حەوت

ئەو تەبعـــە ســـوارە، تونـــد و ڕەوانە
بـــۆ تـــۆ "ئیمـــامی"! زەحـــمەت بـــێ زەوت

قاقڵاوا، ١٣٤٠ی هەتاوی

---

بحر متقارب مثمن اثلم (هجایی): فع‌لن فعولن// فع‌لن فعولن

# ئێشی حاجی بابەشێخ

هەر بـەناسـۆرە هەمیشـە ئێشـی حـاجی بابەشـێخ
قورِ دەپێـون پـاکی قەوم و خوێشـی حـاجی بابەشـێخ

ئێشـی زۆرە نێشـی دووری، ئەرخەیـانم پێـیدەچن
قەوم و خوێش و سۆفیی و دەروێشی حاجی بابەشـێخ

ئەو شەوی ئەو وا بەجێیهێشتین بە دەستی جەم، وەلی
هاتنـە پێشـواز و کەوتنـە پێشـی حـاجی بابەشـێخ

وا فەلەک نـاڵی و مەلەک فرمێسـکی سـووری دارژانـد
عەرز و دار و بەردیش ئاخ‌هەڵکێشی حـاجی بابەشـێخ!

قورِ بپێون هەروەکوو "کامیـل" لە قـیس پـاکوو چـووە
فکـر و تەدبیـر و سەلاح‌ئەندێشـی حـاجی بابەشـێخ

قاقڵاوا، ١٣٣٨ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# بەیداغ

هـاتەدەر ئەورۆ لە میحـنەت میللەتـی مەغـدووریِ کـورد
گەیـنە ئـاوات و مەرامـی خـۆ هەمـوو ڕەنجـووری کـورد

بـیِ‌کەس و بـیِ‌دەر بـوو ئەممـا تـۆ گەیشـتی بـوویە کەس
هەر بـژی بـو لاگریـی مە، ئەی ڕەئیس‌جمهـووری کـورد

زۆر لەمێـژ بـوو کـورد دەڕۆیشـتن، نەگەیـنە ئـارەزوو
تـۆ نزیکـت کـردەوە بـۆ ئـێمە ڕێـگەی دووری کـورد

مـوڵکی کوردسـتان بە دەسـت بێگـانە پـاک وێـرانە بـوو
تۆ لە دەسـتت سـەند و بـوویە ئـامیری مەعمـووری کـورد

ئـــاوەدان و گوڵســـتان و بیِ‌خەزانـــت کـــردووە
بەو چـلەی زسـتان و ڕێبەنـدانە خـوار و ژووری کـورد

هیممەتـی تـۆ بـوو لە سـەر هەر هەرد و بەرزایـی وڵات
دەیشەکێنیِ بـای فەرەح بەیـداغی سـەوز و سـووری کـورد

هێـزی کوردسـتان دەلەرزێنـیِ هەمـوو شـێری ژیـان
عەرز ئەلەرزیِ وا لە بەر پێـی ئەفسـەر و مەئمـووری کـورد

ئەی "زرنگ" تۆش ڕۆح و گیانی خۆت فیدای ئەو زاتە کە!
تـا بڵـێن پێـت ئـافەرین ئەی ڕۆڵەیـی مەشـهووری کـورد

سەرچاوە، ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٨، ١٣٢٤ی هەتاوی، بۆ هەڵکردنی ئاڵا

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# پەیوەند

ئەی زیبــــی گوڵســـــتانم، تەشـــــریفی قەدت دڵبەنــــد!
تەعریفی بەچیکەم من؟ سەروە و گـوڵی لـێ پەیوەنـد

موددێکــــــە گرفتــــــاری، ڕەفتــــــاری بەد و چــــــاکم
جارێ درۆ، جارێ ڕاست، عاشق بە چ بێ خورسـەند؟

ئەو قـــامەتە ڕەعنایـــە، بـــۆ مـــن کـــە لـــە دەس نـــایە
جێگەی مـن و دڵ ناکـا، سـەدها دڵـی لـێ بـوو بەنـد

خاکی بەری پێـت، چـاوم! سـورمەی بەسـەری کـوێرە
تیـری مـوژەکەت فێـرە، کـوێر کـا بەسـەرم هەرچەنـد

فەرمایشـــی تـــۆ چـــا بـــوو، شـــیرین و دڵارا بـــوو
بەو لێـوە جنێـو شـەکرە، بەو شـێوە کەلامـت قەنـد

بێچـــارە دڵـــی "کامیـــل" گیرۆدەیـــی خاڵـــت بـــوو
بـــۆ دانە فـــڕی، زولفـــت کـــردی لەپـــڕا دەربەنـــد

**چۆمی زەنبیل،١٣١٤ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن اخرب: مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن

# سکاڵا

بـــۆچی لـــێم تـــۆرای شـــۆخی جەرگبـــڕ؟!
بـــۆ لەگەڵ مـــن بـــووی هێنـــدە ساردوســـڕ؟

مـــــاوێکی زۆر بـــوو ئەوینـــدارت بـــووم
تـــۆ ساردوســـڕ بـــووی، ئەمـــن گەرموگـــوڕ

جـــوابی خۆشـــی تـــۆ هەر پێکەنـــین بـــوو
منـــیش بـــە چـــاوی فرمێســـکی بەخـــوڕ

هەر ســــــکاڵام کــــــرد، لێتپـــــاڕامەوە
لە ســـەر مـــن کەچـــی لێـــتدا قرِوفـــڕ

تۆخـــوا ئـــازیز گیـــان وایـــە دڵـــداری؟!
تـــۆ بـــێبەینەت و "ئیمـــامی" دڵپـــڕ؟!

ئاقڵاوا، ۱۳۴۲ی هەتاوی

---

بحر متقارب مثمن اثلم (هجایی): فعلن فعولن// فعلن فعولن

# بەهارستان

ئەورۆ بەهـاره، سـەیری چەمەن خۆشـە، خـوار و ژوور
ڕازاوه بـاغ بـە سـەرو و چنـار و گـوڵ و چنـوور

گیا سەوز و جۆگە سەوز و گەڵا سەوز و بێشە سەوز
دار سوور و لاله سوور و چەمەن سوور و خونچە سوور

بەم سەوز و سووره بوو دڵی عاشق کە هەڵگزا
پشکۆی لە دڵ خراوه، دەسووتێ وەکوو تەنوور

ناڵینی بەربەیانی کەو و کۆتری شاخوداخ
دەنگی ژیانە، گیانە بە دڵدا دەکا عوبوور

شمشاڵە، تارە، پیانووه، گەر بیانوو ناگری
ساقی کەرمکە پیاڵە، مەترسە (هو الغفور)

هاتوونەوه بە جەم، کوڕ و کیژانی دڵڕفێن
هەرکەس کە بێ گوڵ و دڵە لاچێ، بچێتە ژوور

زاوایە ئێستە بولبول و گوڵخونچە بووکییە
خاوەن سلووکە، کەوتووه لەولا، قونەوتلوور

کوێستانە پڕ لە ڕاز و نیاز و زمانی حاڵ
جێگە و هیوای حوزووری دڵە بۆتە کێوی توور

---

بحر مضارع مثمن اخرب مكفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعيل فاعلن

لەم کاتــە هەرکەســێ بــە خەیــاڵ و بــە بیــری ژیــن
هەر بولبولــە لــە گــوڵ بەکوڵــە، مــاوە بێمشــوور

هەر چاوەڕێیــە بەڵکــە دەمــێ خونچــە پێکەنــێ
هەڵنیشــتووە لــە بــاغ و دەکــا زیکــری (یــا صــبور)!

"ئــاوات"ی داخــۆ کەنگــێ بەجــێدێ لــە گوڵشــەنا
ئەو شــێتوپێتی دڵبــەکوڵی مەســت و بێشــعوور[1]

**قاقڵاوا، ۱۳۴۲ی هەتاوی**

[1] سەید کامیل وێنەی لە نامەکەی نالی هەڵگرتۆتەوە کە ناردوویەتی بۆ سالم و ئاوا دەست پێدەکا:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروورا
ئەی پەیکی شارەزا بە هەموو شاری شارەزوور

لە غەزەلی یەکەمدا تەنانەت قفڵبەندی جەمسەری شێعر و هێندێک زاراوەش هەر لە نالی خوازراوەتەوە.

# سروەی سەحەر

قوربــانی تــۆزی ڕێگەتــم ئەی ســروەکەی ســەحەر!
ئەی شــارەزا و بەڵەد بــە هەمــوو کێــو و دەشــتودەر!

کــاتی گزنــگ چیــا بــە نەســیمت مــونەووەرە
ڕەنگــین دەبــێ لــە تــۆقی ســەریڕا هەتــا کەمەر

ئەم ڕەنگی زەرد و سوورە لـە سـەرڕا بـە لـوتفی خـۆت
دێنــی بــە هەدیــە بــۆ دەرودەشــت کــاتی گەشــتوگەڕ

چەشــنی کــزەی شــەماڵ بــە، وەرە لام بــە گەرموگــوڕ
وەک ئــاهی مــن مەبــە، کەســەکەم! هێنــدە ساردوســڕ

بــاش بــۆم بگێــڕەوە: چییــە بــاس و خەبەر لەوێ؟
لێــرە بــە مەرگــی تــۆ خەمــە بــاس و خەمە خەبەر!

ئێمــــە هەمــــوو پەرۆش و پەرێشــــان و هەڵــــوەدا
وەک تــــۆ هەناســــەســــەرد و ســــەحەرخێز و دەربەدەر

ئاهەنــگ و کەیــف و شــایی و جێــژن و ســروورمان
نــاڵین و ئــاخ و حەســرەت و خوێنخــواردنی جــگەر

---

بحر مضارع مثمن اخرب مكفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعيل فاعلن
بڕوانە ژێرنووسی پێشوو.

ڕۆژێ کــه جێژنـــه، کــاتی ســروووره، کەچـــی لەپــڕ
دەگـــرێ بەبـــێ موحاســـەبە، دەرگـــا بـــە ئێمـــە شـــەڕ

پیـــاوی جحێـــڵ و پیـــره له پـــێش تیـــری دوژمنـــان
وێســـتاوه بێپەنـــا و پەســـیو، بـــێزرێ و ســـوپەر

خێـــزان و مـــاڵی دوژمنـــی مـــه، گـــوڵ دەکەن له بەر
خێـــزان و خـــاوی ئێمـــه کەچـــی گـــڵ دەکەن وەســـەر

بەرمـــوور و خشـــڵ و زێـــوەری مـــاڵی مـــه، مـــووروووه
یـــاقووت و لەعلـــه، خشـــڵی ژنـــی وان و زێـــو و و زەڕ

هەریەک بـــه ئـــێش و ئـــۆف و بـــه دەردێـــکەوه تلایـــن
هەریەک له بەر خەمێکـــه کـــز و مـــات و لاڵ و کەڕ

چـــاوی تەڕی گەلـــه کـــه دەبـــارێنێ خـــوێنی گەرم
فرمێســـکی ســـووریانه له جـــێگەی دوڕ و گـــوهەر

یـــاڕەببی! چـــاوەڕێی کزەبـــای ڕەحمەتـــین هەمـــوو
ڕەحمـــێ بـــه ئـــاگر و کـــوڵی دڵ کـــه و بـــه چـــاوی تەڕ

بەڵکـــوو چـــرۆ وەدەرکەنەوە بـــاغی لاوەکـــان
بێســـایەبان و بـــێبەر و بـــێبەرگ و بێســـەمەر

"کامیل" خـــودات دەگەڵ بـــێ بـــه ئـــاواتی خـــۆت دەگەی
ئەمجـــار بـــه ڕەحـــم و لـــوتفی خـــودای خـــاوەنی هـــونەر

گەردیگلان، ١٣٢٠ی هەتاوی

## ئەمە ژینە؟

تۆخـوا ئەمـە ژینـە کـە وەهـا کەوتمـە شەشـدەر؟
ڕێـی چـوونەدەرم هەر بـە خەویـش نـایەتەوە بەر

هەرکەس بـە هەواڵێـک و بـە سـازێ لـە سـەمایە
ئەمنـیش نـە هەوام مـاوە، نـە سـاز و نـە هەمئـاوەر

خـوایە چ تەلەسـمێکە کـە مـن کەوتمـە نێـوی!
چەند مەحکەم و بێڕێگەیـە وەک سـەددی سـکەندەر

ئەعـزام کـە بـە قـوڕدا چـووە، زینـدانی بەڵایە
ئەم مەسـکەنە جێـی بـێکەس و مسـکینە سەراسـەر

هەر چوومـە دەرێ، خۆزگـە بـە ناومـاڵێ دەخـوازم
گەر دێـمەوە ژووری، کەچـی ئاواتمـە بـۆ دەر

زوو سـەڵتەنەتم بـوو، کەچـی ئێسـتا ئەوە سـەڵتم
جـاران وەکـوو شـا بـووم و ئەوێسـتاکە قەلەنـدەر

مەنفـوور و سـەگ و بـێئەدەب و شـەرم و حەیـایە
هەرکەس بگـرم مـن، چ بـە نـۆکەر، چ بـە سـەروەر

وەختـە وەکـوو دێوانـە وە کێـوی بـدەم ئەوڕۆ
غەم قووتمـە، غەم بەرگمـە، غەم هەمـدەم و یـاوەر

**قاقڵاوا، ١٣٣٧ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف: مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن

# شاری مەستان

ئێـــرە وشـــکارۆی هەمـــوو جێگـــە و وڵاتانــــە مەگەر؟
وەک دڵی من تەنـگ و تاریـک، بـۆچی غەمدانـە مەگەر؟

وا شـــپرزە و تێکچـــووە، چێشـــتی مجێـــور باشـــترە
بـــێ‌کەس و بـــێ‌دەر، هەتیـــوی دەرک‌وبانانــــە مەگەر؟

باسـی نانـت کـرد لـە هەرجـێ، سـەد نەفەر ئەستۆکەچە
ئەم وڵاتـــە قـــاقڕە جێـــی قـــووتی لاتانـــە مەگەر؟

چەرخی گەردوون بۆ لە سەر من جارێ خول نادا، چییە؟
بۆچی نەگبەت هەر بەشی من؟ هەر لە من جوانـە مەگەر؟

مەسـکەنی جـنن و پەری هەرکەس دەبینـێ شـێت دەبـێ
ئەم بەقـــوڕگیراوە بـــۆ جێـــی غەیـــرە ئینســـانە مەگەر؟

لائوبـــاڵی و بـــێ‌خەبەر، لاقەیـــد و بێ‌تەدبیـــر و ڕا
کەس لە کەس گوێ نـاگرێ، بـۆ شـاری مەستانە مەگەر؟

قاقڵاوا، ١٣٣٤ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# ئاڵای پیرۆز*

له هەمـــوو کـــوردی وڵات بـــێ پیـــرۆز
خاســـــه بـــۆ وانه لەگەڵ مەن دڵســـۆز

بـــۆ ئەوانەی کە بە پێشـــواز هـــاتن
فیرقەیـــی پیـــادە و چەنـــد ســـواری قـــۆز

هەر بـــژین میللەتـــی کـــوردی بەئەبەد
هەر بە شـــان هەڵگـــرن ئـــاڵای پیـــرۆز

دوژمنـــی کـــوردی هەڵات بـــۆی دەرچـــوو
رێـــوییە و کلکـــی ئەوا گـــرتە گەڵـــۆز

**گەردیگلان، ١٣٢٤ی هەتاوی**

* کاتی هەڵکردنی ئاڵای کوردستان لە شاری بۆکان، مام هەژار ئەم شیعرانەی "ئاوات"ی خوێندۆتەوە.
بحر رمل مسدس مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلن

# لەشکری ئەگریجە

دەستەدەستە بە سەفی لەشکری ئەگریجە بە ڕێز
عیشق و عەقڵم لەگەڵ ئەو دەستە دەکەن جەنگ و گوریز

قەدی ئاڵایە کە هاڵاوەتە ڕوخسار و بڕۆ
شێر و خورشیدە عەلامەت، چ جوانە، چ بەڕێز

ئەفسەری لەشکری ئەگریجە دوو چاوی جەنگین
هەر دەوەنگێوێ بە تیری موژە، هەردوو خوێنڕێز

سەنگەری غەمزە دەبەستن لە کەمینگای چاوان
وەکوو ڕاوچین و دەبەن بۆ دڵی زارم پاریز

خوسرەوی سەڵتەنەتی ملکی وجوودە عیشقی
عەقڵەکەم مەرکەبی خۆشڕۆیەتی چەشنی شەودیز

گەردیگلان، ١٣٢٠ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# سەروی نەوڕەس

بــە ئــاگری دووری تۆیــە بوومــە قەقــنەس
نەمــاوە گیــانەکەم، هیــوام بــە هــیچ‌کەس!

ئەگەرچـــی پیـــرم، ئەممـــا وەک منـــاڵان
دڵـــم دەشـــنێ لـــەبۆ ســـەروێکی نەوڕەس

ئەتـــۆ ســـەر تـــا بە پـــێ گـــوڵزارە بـــاڵات
منـیش ســەر تـا بە پـێم یـا خـارە یـا خەس

دڵـــــــم دەڕوا بەرەو بـــــــاغی جوانیـــــــت
ئەگەر پەیـــدا بکـــا ڕۆژێکـــی دەســـرەس

بەرەو ڕووی گــۆڕ ئەچــم هەرهاکــە زانیــت
لە ســـەر تەرمـــم بنیشـــن داڵ و کەرکەس

بـــە نـــاڵین و ســـکاڵا و شـــین و گریـــان
لە قیســـی چـــوو "ئیمـــامی" ژیـــن، ئیتـــر بەس

**قاقڵاوا، ١٣٣٤ی هەتاوی**

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# سکاڵا

ڕووڕەشی دەرگای خوداوەندم لە بەر نەفسی خەبیس
سەیری ئامالی گڵاوم کەن دەگەڵ ئاکاری پیس

نەفسەکەی ئەممارەکەم وەک مارە، چۆن بۆم دەسرەوێ؟
ڕەنگ‌وڕووشم هەروەکوو دارێکە پیر و وشک و سیس

کاکە دونیا خۆی گڵاوە، هەرکەسێکیش وێیکەوێ!
تێکەڵە بێ‌شک دەگەڵ خاشاک و ئەشیایی نەجیس

من قەرارم وایە ئەوجار تەرکی خۆشی‌کەم بە دڵ
خواردنم نانێکی ڕەق بێ، بەرگ و پۆشاکم تەلیس

عومری بەدبەختیش ئەوەند تووولانییە نابڕێتەوە
هێند درێژ و نالەبار و خوار و خێچە وەک گوریس

دەک بەڵای لێدا ژیانی وا بە نەنگ و عارەوە
نەسرەوێ عومری ئەوەند تاڵ و ژیانی وا خەسیس

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# دەخولێمەوە

هەروا بە داخــی خــونچەوە دەخــولێمەوە لــە بــاغ
هەرواش کەچـــی بە داخەوە نەمــدی لەوی ســۆراغ

لالەم دەدی لـــە بـــاغ وەکـــوو ســـاقی لـــە مەجلیســـا
دێــت و دەچــێ بە بــاوە، بــە دەســتی هەبــوو ئەیــاغ

چـــاوی ڕوابـــوو نێرگســـی بێچـــارە بـــۆ گـــوڵی
ئێشـــا دڵـــی کـــە خونچەگـــوڵی جەرگـــی کربـــوو داغ

شـــەوبۆ و هەڵاڵـــە، لالـــە وو نەســـرین لـــە ڕۆژپەڕا
جوان بوون لە گوڵشەنا، هەموو بووبوون بە شەوچراغ

تـــۆرا، لـــە بـــاغ و گوڵشـــەن "ئیمـــامی" وەدەرکەوت
ڕووی کردە چـۆڵ و بەنـدەن و ســارا و شـاخ و داغ

گەردیگلان، ١٣٢٨ی هەتاوی

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# نامەی بانگهێشتن*

قەدەم هەڵبێنـــە خۆشکـــە خـــاتری تەنـــگ
بەپێی خۆت بێنە شـادی و کەیـف و ئاهەنـگ

خەریکـــی ڕشـــتنی ڕەنگـــی عەرووســـین
بەبـــێ تـــۆ ڕیســـی ئێمـــە نـــاگرێ ڕەنـــگ

ئەتـــۆ ســـەرقافڵەی ڕێـــگەی مـــرادی
منـــیش کوێســـتانە ڕێـــگەم، قـــافیەم تەنـــگ

ئەوا چـــاوم لە ســـەر ڕێتـــە بەبـــێ هەســـت
ئەوا ڕۆحـــم لە بەر پێتـــە، بـــەبێ دەنـــگ

دڵـــی بێچـــارە بـــۆ تـــۆ وەک کەبـــابە
نییـــە بێ‌تـــۆ، شـــەڕابی نـــاب و گوڵڕەنـــگ

هەمـــوو ئەســـپابی شـــادی، گردوکـــۆیە
کەچـــی بـــێ تـــۆ تەرازووی عەیشـــە لاســـەنگ

وەرە تـــۆ ســـەیقەڵی بـــۆ قەلبـــی "کامیـــل"
بـــە لوتفـــت لابەرە گیانـــە لـــە دڵ ژەنـــگ

**گوندی شێخچۆپان، ١٣٣١ی هەتاوی**

---

* دەعوەت بۆ شایی کوری گەورەی خوالێخۆشبوو سەید تاهیری ئیمامی
بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# کەرەی کرد بە زەنگ؟

ئەوشـــۆ لـــە بەزمـــی یـــاری شـــوخ و شـــەنگ
عـــــالەم خرۆشـــــا، تێکـــــرا بێدرەنـــــگ

چ بەزمێـــک؟ بەزمـــی کەی و کەیخوســـرەو
چ شـــۆخێک؟ شـــۆخی بێعـــار و بێنەنـــگ

وا کـــــــۆڕ ڕازاوە بێئەغیـــــــار، ئەوچەل
بـــۆم تێکـــە مەیگێـــڕ، شـــەرابی گوڵڕەنـــگ

زڕە و خـــــڕەی دڵ، ئـــــاه و نـــــاڵەی نەی
چـــریکەی تـــار و زرمـــە و گـــرمەی چەنـــگ

گیـــانم ســـەودا کـــرد بـــە پیاڵێـــک، ســـاقی
مـــــاچێکی بـــــاقی دامەوە، بێدەنـــــگ

لەم ساتوســـــەودا، لەم ســـــاقی و بـــــاقی
یـــــاران دڵخۆشـــــن، دوژمنـــــان دڵتەنـــگ

پەری چۆتـــــە بـــــاغ، گـــــوڵ بێبـــــرەو مـــــا
بێشـــــەوق و زەوق، بێبـــــۆن و بێڕەنـــــگ

بـــــــاخەوان ڕووتەڵ، بـــــــۆی وەدەرکەوت
وەک دەڵـێن: بولبـول مـایەی بـوو بـە سـەنگ

---

بحر متقارب مثمن اثلم (هجایی): فعلن فعولن// فعلن فعولن

لەم گێـــرە و کێشـــەی عیشـــق و دڵـــداری
لەم هەرا و بەزمـــی یـــاری شـــۆخ و شـــەنگ

داخـــۆ ئەوینـــدار چـــی وە چەنـــگ کەوت؟
یـــا خـــۆ "ئیمـــامی" کەرەی کـــرد بـــە زەنـــگ؟

**قاقڵاوا، ١٣٤٧ی هەتاوی**

# زستان

زســـتانە، بەفـــرە، حەشـــرە، وڵات پـــڕ لە ناڵەنـــاڵ
دێـــوی ســـپی بە قیـــنەوە هـــات، بـــۆتە پیـــرەزاڵ

هێنـــد قورســـە، هێنـــد گـــرانە، هەڵســـتانی حەســـتەمە
وەک مۆتەکە لە سەر سـەر و سـینگانە مانـگ و سـاڵ

سـەر سـینگی گرتـووین و هەناسـە نەمـا بە کەس
کەوتـوووینە ژێـر کلـیلەوە، دەبـزووینەوە بە حـاڵ

ئینســـان لە ژووریێ مـــاونەوە، وەک کەوی قەفەس
وەک مەیـــتە پیرەڵـــۆکێ لە عەرزا بـــبن شـــەلاڵ

مـــاوین؛ بەڵام چ مـــان؟ بە خـــودا مەرگ خۆشـــترە
مەرگـێکە نێـوی ژیـنە، چ ژیـن؟ ژینـی تـرش و تـاڵ

بـــێبـــاڵ نەمـــاوە گەر دەرەتـــانی، تەنـــانەتیش
باڵـدارەکان ـ فەقیـرە! ـ هەمـوو کەوتـوون لە بـاڵ!

هەر پێکەنـین بـوو کـاتی بەهـاران دەهـاتە گـوێ
هەر زیرەزیـــرە ئێســـتە لە ســـەرمان و زاڵەزاڵ

کیژان بە توێی کراسێ لە گەشت بـوون و گـوڵچنـین
ئێسـتێ لە خـۆ وەکـۆوە دەکەن سـەت سـڕ و سـیپاڵ

---

بحر مضارع مثمن اخرب مكفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعيل فاعلن

هێنــدەم تەمەن ببــایە کە دەمــدی بە چــاوی خــۆم
ئەو کــاتە خۆشــە دێــنەوە سیســارک و پیــرەداڵ

یــادی بەخێــرێ کــاتی بەهــار و کــزەی شــەماڵ
ســـەیران و شـــایی گرتنـــی لاوان و کیژوکـــاڵ

چەند شۆخ و شەنگ و جوان و لەبەردڵ دەچوونە باغ
بەرز و بڵنــد و دڵــبەر و لێوئــاڵ و چــاوکەژاڵ

یــادی بەخێــرێ ئەو دەمە قاســپەی کەوان دەهــات
جوانیــان دەرشــت نێــرە و مــێ رێــزە وردەخــاڵ

ئەو کــاتە، ئەو دەمــانە کە خێــڵ دەچــنە بەنــدەنێ
یادیــان بەخێــرێ بێریــی و کابــانی گەورەمــاڵ

جــێژوان بەتــاڵە، داخــۆ کــوڕ و کیــژی نیشــتمان
هێشـــتا لە بیریـــانە؟ لە دڵدا دەکەن خەیـــاڵ؟!

داخـــوا دووبـــارە دێـــتەوە گوێمـــان و دێ بەهـــار
دەنگــی شــوان و تــوورەیی بلــوێر لە هەرد و یــاڵ؟

داخـــوا دەگەیـــنە فەســـڵی بەهـــار و دەژیـــنەوە؟
وەک گیــا و گــوڵ لە ژێــر زەوییــا دێــنەدەر منــاڵ؟

کــاکی "ئیمــامی" تــۆ تەمەنــت زۆرە، حەســتەمە!
بــووژانەوەت بە تــاوی بەهــار، موشــکیلە و مەحــاڵ

قاقڵاوا، ١٣٥٠ی هەتاوی

# بە ناوی تۆ

بــە یــادی تۆیــە دەچــنم خــونچە وو گــوڵ!
بــە تیــری تۆیــە کــون بــوو دڵ، دەدا چــڵ

بە بـۆی شـەوبۆی گـوڵی کوڵمـت دەسـوورێم
دەڕۆم ئەم دار و ئەو دار، ئەم چــڵ، ئەو چــڵ

لــە نێــو زولفــی ڕەشــتدا هەر دەخــوێنێ
شــــەوێ تــــا ڕۆژ دڵــــم وەک پیرەبولبــــول

لە زولف و خەتت و خاڵی تۆ دروسـت بـوون
وەنەوشــە و ســوورەگوڵ، شــەبۆ و ســونبول

بەخێرێــی نێرگســی شــەهلا، لــە باخــان
چراخانــە لــە خۆشــی تــۆ لە نێــو گــوڵ

ئەوا بــۆنی گــوڵی تــۆی کــرد "ئیمــامی"
بــە بــێ‌هۆشــی لــە خۆشـیان هەر دەدا خــول

**کانی‌یەن، ۱۳۳۰ی هەتاوی**

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# بێچارەیە کامیل

بڕوانــە چ بەدبەخــت و چ بێچارەیــە کامیــل!
چەنــد دەربەدەر و بــێکەس و ئاوارەیــە کامیــل!

چەنــد دڵبەغەم و مــات و پەرێشــان و بــڵاوە
چەنــدە لــەکوڵ و زار و جگەرپارەیــە کامیــل!

ئەی خالیقی مــن، ڕازیقــی مــن، دافیعــی دەردم
ڕەحمێ، کە کوژەی حەسرەتی ئەمجارەیە کامیل

سەیری جــگەرم، لەتلەتــە، زووخــاو دەدەڵێنــێ
یەک کــالبەدی کەوتــوو و بێکارەیــە کامیــل

مەیلت کە لە ســەر دەربەدەری و قوڕبەســەریمە
یــاڕەببی چ کــارێکی بەم ئەســرارەیە کامیــل؟!

هەرچــی کــە ئەتــۆ مەیلتــە، پێمخۆشــە خــودایە
بێدەنگ و ســەدا و قاڕەیــە، بێباڕەیــە "کامیــل"

**قاقڵاوا، ۱۳۵۶ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

# سات‌وسەودا

عاشـــقی ڕووی دڵـــبەری بـــێ گەردی وەک مینایـــە دڵ
دای لە دەس هەرچی کە بووی بەو سات و بەم سەودایە دڵ

عەقـــڵ و فکـــر و بیـــروڕای تێکـــڕا لەقیس‌چـــوو ئەوکەڕەت
مـــاوە ئەو بێ‌چـــارە، ئەو دێوانـــە، بێ‌ســـەرمایە دڵ

وا مەزانـــە پارچەگۆشـــتێکی ڕەشـــی بێ‌کـــارەیە
زۆر بەشـــان و شـــەوکەت و جـــوان و سەروســـیمایە دڵ

جەمیان، ١٣٢٩ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# بەفری خەم

بەفری خەم دیسان لە سەر کوێستانی دڵ
کەوتووە، ڕووخاوە دەرکوبانی دڵ

باری خەم دایگرتووە، قورس و گران
بوو جدەو بەو کۆڵە، کۆڵ و شانی دڵ

بێسەروسامانی خۆم سەد چەڵ بە توون!
داخەکەم بۆ بێ سەروسامانی دڵ

هەر بەناسۆرە، برینی کارییە
ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ زۆرە ئێش و ژانی دڵ

وەک دەڵێن میری ئەوینی پێوە دێ
زۆر بەڕێز و گەورەیە میوانی دڵ

ئاوری عیشقی هەڵیقرچاندووە
جەرگ و دڵ بۆتە کەبابی خوانی دڵ

ڕێگەیی هات و نەهاتت دیتە بەر
بیبڕە "کامیل" بە پشتیوانی دڵ!

**قاقڵاوا، ۱۳۵۴ی هەتاوی**

---

بحر رمل مسدس محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# زمانی دڵ

مووددێکە نووکی خامە لە وەسفی جەماڵی دڵ
دەدوێ، بەڵام زمانی لەتە، بێویساڵی دڵ

ئەو ڕۆییوە، کەچی منیش هەڵبەستی بۆ دەڵێم
قاسید! هەڵێ هەتا دەگەیە دەرکی ماڵی دڵ

نامێکی ڕێکی خامە بدە دەستی دڵ، بڵێ
دەیگوت چلۆنە داخۆ برا ماڵوحاڵی دڵ؟!

عەرزت دەکا: زەمانە سیاکاری خۆش دەوێ
بۆیە لە مل منی بەگوناهە وەباڵی دڵ

ئەی ئافەرین قەڵەم! بە زمانی شڕ و لەتیش
تاریف دەکەی لە دڵ، بە زمانی زوڵاڵی دڵ

گەردیگلان، ١٣١٩ی هەتاوی

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# دێوی سپی

خێڵــی جحێڵــی ڕۆیــوە، پیــری گەیشــتە لام
ناچــار ئەبــێ بــە پیــریەوە بــێم و بڵــێم ســەلام

میوان دەڵــێن عەزیــزە، دەبــێ ڕێــزی لــێ گــری
جا چۆن ئەمن لە دێــوی ســپی بگــرم ئیحتــرام!

ئەو زۆر نەمــاوە لام و بەجێــیهێشــتم و هەڵات
نــازانم ئەم چلــۆن دەبــێ، میــوانی وا بەســام!

میــوانی دوایی‌یــە ئەمــە، پــێم وایــە مــاوەیەک
لای من دەبێ مولازیمی ڕۆحە بە سوبح و شــام

تا مــن نەبــا لەگەڵ خــۆ، بەجــێم نــایەڵێ دەمــێ
یاخوا بە خێرێ، مــۆری ســپی مەرگــی پێوەنــام

ســەرچاوەکەی ژیــانمی کــرد تــاڵ بــە هــاتنی
بەفری سەرانە هاتووە، یا مووی سپی بوو؟ کام؟

هەرچی کە بــوو، گرانــە "ئیمــامی" لــە بەر دڵان
بۆیە بە جارێ وەک فەنەری تەخت، تێکشــکام

قاقڵاوا، ١٣٤٠ی هەتاوی

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

## مەجنوون وەرە

مەجنوون، وەرە قوربانی سیفاتی حەسەنت بـم!
حەیرانی سەفای نەجـد و وڵاتـی یەمەنـت بـم!

کـــوژراوی بیابـــانگەڕیـــی و دەربەدریـــتم
شەیدایی هەمـوو چۆلگـە و دار و دەونـت بـم!

هەرجێگە گەیشـتی، وەتەنـت بـوو لـە زەعیفـی
قوربانی هەمـوو گەرد و غوبـاری وەتەنـت بـم!

چـاوت بـووە ئاوپاشـی چەمەنـزار و گوڵسـتان
شـەیدایی گوڵسـتان و بیسـاتی چەمەنـت بـم!

مردوویی قسەی خۆشـم و لەهـجەی نمەکینـت
ئاوبردەیی نوتقی خۆشـی شەککەرشـکەنت بـم!

بۆ هاودەمی تۆ قابیلە "کامیـل" بـە شـەو و ڕۆژ
قوربانی ڕەش‌وڕووتـی و زەعفـی بەدەنـت بـم!

زەنبیل، ١٣١٥ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

# مافی خۆمە

مــافی خۆمــە لــێم گەڕێــن بــا هەر وەهــا بێچــارە بــم
مەخسەرەی دۆم و دوڕاجی ئەم ســەر و ئەو خــوارە بــم

با وەکوو کــوێر و شــەل و نوقســان و بــێچــارە و هەژار
تــاکوو دەمــرم چــاوەڕێی ئیحســان و پــووڵ و پــارە بــم

بەو هەمــوو بــاری گوناهــە بــوو جــدەو پشــتم خــودا
تاوەکوو کەی دەست لە ئەستۆی پیسی ئەو کــردارە بــم؟

کەی خەبەردارم دەکەی یا ڕەب بە زەنگــی مەرحەمەت؟!
بــا بەس ئــاخر مــوبتەلای ئەو شــوێنە، ئەو ئاکــارە بــم

بەم هەمـــوو تەبعـــە ڕەوانـــە، بەو هەمـــوو هـــۆنراوەوە
چاکـــە نەبمـــە شـــوهرەیی ئافـــاق، هەر ئـــاوارە بـــم

عــاقڵی و ژیــری و زرنگــی ئێســتە بــێمــۆدن لە لام
باشە وەک مەجنــوونی ســەرگەردان و وێــڵ، پەتیــارە بــم

مەمکەنــە بەرمــوور لە بەرچــاوان بــە دەنــگ و باســەوە
با وەپشت گوێم خەن جوانان، لــێمگەڕێن بــا گــوارە بــم

نەچمە سەر چاو وەک برۆ، وا چاکــە مــن بــۆ مــاوەیەک
هەروەکوو ڕیشێکی بێئیش، جوانــە هەر لەو خــوارە بــم

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

شــەرتە ڕازی عیشــقی خــۆم هەر هەڵگــرم تــا مــردنم
بــا لــە قەبــریش‌دا ئەمــن ســندووقی ئەو ئەســراره بــم

تۆ کە گــۆت بردۆتــە دەر "کامیــل" لــە گــوڵزاری ئەدەب!
حەقتە فەرمووی: هەر ئەمــن بــا شــێتی ئەو گــوڵزاره بــم

**قاقڵاوا، ١٣٥٠ی هەتاوی**

# پاڕانەوە

من سەگێکم، سەگێکی دەرگاتم
گەرچی بێفکر و بێ موبالاتم

گەرچی برسی و فەقیر و بێهێزم
وا بە هیوا و هومێدی تۆ هاتم

کەسەل و بێوەڕ و لە پاس کەوتوو
نانی شوانم دەخوارد و هەر لاتم

پیر و بێکەڵپە مام و لێقەوماو
بۆیە ڕووزەردم و کز و ماتم

لوقمەنانێ لە دەرکی تۆم بدەنێ
وەدەزانم ئەمیری شاماتم

ناهومێدم مەکە لە ڕەحمەتی خۆت
بێنەجێ ئارەزووم و ئاواتم

وا "ئیمامی" دەڵێ: برا لە خەمان
شێعر و هۆنراوە و مەقالاتم

**قاقڵاوا، ١٣٥٢ی هەتاوی**

---

* بحر خفیف مسدس مخبون محذوف: فاعلاتن مفاعلن فعلن

# قوربانی وەفاتم

غەرقم لە غەمی هیجری تۆ، بۆیـە کـز و مـاتم
زولفــی وەکــوو زنجیرتــە ئەســپابی نەجــاتم

بیخە ملـم و بمخـە قەراغـێ بە سـەری خـۆت
ئەی ســەروی بڵنــدقامەتی شــیرین‌حەرەکاتم!

لەو ڕۆژەوە من کەوتمە نێو بەحـری غەمـی تـۆ
ڕۆشن بووە لای ئەهلی وەفـا عەهـد و سـوباتم

هەرچی لە دڵتدایە بەبـێ تـرس و خەم و بـیم
بیکــە لەگەڵــم، گیانــە بــە قوربــانی وەفــاتم

مەعلوومە کە تـۆ خـاوەنی جـوانیی و جەمـاڵی
هەرچەنـدە نییـە مـاچێ لـە لێـوت بـە زەکـاتم

وەک لێـوی بەدەخشـانتە گـوڵ، خەنـدە سـیفاتە
بۆیـە وەکـوو بولبـول بـە هومێـد و بـە تەمـاتم

"کامیل" کە وەها غەرقە لـە گێـژاوی غەمـی تـۆ
تــۆ خــوا بگــرە دەســتی، عەزیــزم بە فیــداتم

گەردیگلان، ١٣٣٠ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف: مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن

# بێهەستم

لەمێژە من کە زەدەی غەمزەیی دوو نێرگسـی مەسـتم
وەداوی زولفی کە کەوتم، بە شێتی چا بـوو خەلەسـتم

دڵـــی پســـاندم و ڕۆیـــی، بەڵام بەوەم چـــا بـــوو
گەڕاوە لام و بـــە تـــاپێکی بســـکی وی بەســـتم

هەڵاوەســـاوە دڵ و مـــن لە دووی لە پـــێ کەوتم
مەگەر بـە ڕەورەوە، گـاگۆڵکەکەم، لـە پێـی خسـتم

بە پیری سـەیرە چلـۆن بوومـە پەنـدی پیـر و جحێـڵ
وەکـــوو هەڵاڵـــە لـــە دەشـــتی گـــوڵام و پێپەســـتم

کـە دیتـە بـاغ بـە خەیـاڵم لـە دەسـت و پێـی هـاڵێم
کەچـی بـە داخەوە خـۆ بەنـد نەبـوو لەوێـش دەسـتم

جنێـــوی دابـــوو بـــە مـــن یـــار بـــە لێـــوی شـــیرینی
منـیش شـەوێکی بـە بێدەنگـی چوومـە لای گەسـتم

لەوێ شـــەوێ دەم و لێـــوی "ئیمـــامی" چەســـپاوە
وتەی نەمـــاوە، ئەوا بۆیـــە ئێســـتە بێهەســـتم

قاقڵاوا، ١٣۴۵ی هەتاوی

---

بحر مجتث مثمن مخبون محذوف: مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن

# ئەسپی نەگبەت

مـــن ئەوا غەرقـــی گونـــاه و قەســـوەتم
غەرقـی بەحـری پیسـی قـوولّی شـەهوەتم

خۆ بە چابوکسواری مەشهوور بووم، کەچی
چونکە زۆر سەرکێش بـوو ئەسـپی نەگـبەتم

وا هەڵیگـــرتم لە ڕێـــی هـــات و نەهـــات
چـــوو ســـەر و مـــاڵ و ژیـــان و ســـەروەتم

هێنـــد لـــە دار و بەردی دام، کەللـــەڕەقە
هەر نەمـــا لام کاکـــە، شـــان و شـــەوکەتم

بەو هەمـــوو بـــاری گونـــاهەم خـــۆ خـــودا!
چـــاوەڕێی دەرکـــی هەراوی ڕەحمەتـــم

مـــن وەکـــوو شـــێری ژیـــان بـــووم، ئێســـتەکە
مامـــــەڕێوییێکی کـــــز و بـــــێ‌هەیبەتم

هەروەکـــوو ڕێـــویم، ئەوا لێـــرە و لەوێ
ئەی "ئیمـــامی"، هەر خەریکـــی فرســـەتم

**قاقلاوا، ١٣٣٧ی هەتاوی**

---

بحر رمل مسدس محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# لە قەڵەم کەوتووم

ڕەحمــێ بــە دڵــی شــێتم، بێتــاقەت و خەمبــارم
هەر ڕەعیەتــــی بەرپێـــتم، بێکـــارم و پاکـــارم

مالیک نییـە غەیـری تـۆ، مڵکیش هەمـوو هەر هـی تـۆن
ڕێـــگەم بـــدە یـــا ڕەببـــی، بـــێمەلجەء و ناچـــارم!

ئەی خـــالیقی ڕۆژ و شـــەو، ڕۆژم ڕەشـــە هەروەک شـــەو!
دووركەوتـــوو لـــە یـــارانم، هەمســـایەیی ئەغیـــارم

جاران وەکوو شـا وا بـووم، شـای دوورەخەم و دڵخـۆش
ئێســـتا کـــز و سیســـی خەم، بەر تـــانە وو پلـــلارم

ئەو دوژمنـــی ئەمڕۆکـــە، دوێنێکـــە ڕەفـــیقم بـــوون
وا مـــامەوە تەنیـــا مـــن، بـــێهەمـــدەم و بێیـــارم

جـاران وەکـوو بولبـول بـووم، بـۆ مەدحـی گوڵســتانم
ئێســـتا لـــە قەڵەم کەوتـــووم، بێســـەوزە و گـــوڵزارم

شـــێواو و پەرێشـــانم، بـــێدەنگم و دەشـــناڵم
گریـــانم و خەنـــدانم، خۆشـــنوودم و بێـــزارم

تۆ مالیک و من مەملـووک، تـۆ خـالیق و مـن مەخلـووق
موســـتەوجبی ڕەحمـــی تـــۆم، یـــا ڕەببـــی گونەهـــبـارم!

---

بحر هزج مثمن اخرب: مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن

مەخدووشــە لەف و نەشــرم، مەغشووشــە هەمــوو فکــرم
تێــک‌چوون بــە غەم و غوســـە، ئەفکــارم و ئەشــعارم

ئەممــا بە خوداوەنــدیت، ئەم عەبــدە زەلــیلەی خــۆت
ئەم‌جـــارە نەجـــاتی دەی، هەرچەنـــدە گرانبـــارم

بــاری گــونەه و عیســیان، وا پشــتی جــدەو کــردم
ڕەوتــم هەمــوو لێ‌تێــک‌چوو، وا هێنــدە بەئــازارم

"کامیل" وەرە ســەیری دڵ، خـۆش‌نەغمەیـە وەک بولبـول!
خۆش‌ڕەنگ و جوان وەک گوڵ، هەرچەند بە مەسەل خارم

قاقڵاوا، ١٣٤٥ی هەتاوی

# تەختەی سەرئاو

ســازام بە خــودا چــابوو لەگەڵ هەر خەم و دەردم
وێســـتام لــە بەرابەر هەمــوو ســەختیم، کــە مەردم

دانیشــتوو بــە هەر دەشــت و بیابــان وەکــوو تــۆزم
جارێک کــە لە دووی قافڵــە هەســتم وەکــوو گەردم

گــا تــۆزم و گــا گەردم و گــا دەردم و گــا مەرد
بڕوانـــــە لەگەڵ حادیســـــە مەردم، بـــــە نەبەردم

بەســـراوە هەمـــوو شەشـــدەری دونیـــا لـــە منـــی زار
لەم تەختەیـــی ســـەر ئـــاوە نەمـــا مـــۆرەیی نەردم

سەد چەل دڵی "کامیل" چەڵەمە و تەنگی وەبەر هات
بەو حـــاڵەوە هەر مـــاوە، تەماشـــا دڵـــی بەردم

زەنبیل، ١٣١٥ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

# پێ پەستم

وەک قەڵەم دایـــــیمەن ســـــیاکارم
بۆیـــە بەو زولفـــی تـــۆوە دڵ بەســـتم

گەرچـی پیـرم بـە عیشـقی تـۆ، سـەیرە
کەچـــی جوانـــە کەلام و هەڵبەســـتم

چـــاوەکەم، چـــاوی تـــۆ بـــە وشـــیاری
دەرفێنـــێ دڵـــم، دەڵـــێ: مەســـتم

چوومـــە بـــاغی گـــوڵان و لێـــی کەوتـــم
وەک جلـــە، بێ ســـەدا و پێ پەســـتم

بەڵکـوو تـۆ بێتـە بـاغ بـە سـەر مـن دا
ڕابـــری؛ بۆیـــە مـــات و بێ هەســـتم

بـــە ڕەقیبـــی ســـەگم بڵـــێ بەس بـــێ؛
هێندە هـات ئەو لـە دووم، لـە پێـی خسـتم

دەچمـــە کێـــوان دەڵـــێم مـــنم مەجنـــوون
وێڵـــی مەعشـــووقەیێکی ژێردەســـتم

وەکـوو چـۆن "قەیـس"ی کـردە مـاڵوێران
ئەمنـی خسـت لـە پـێ کـە هەڵنەسـتم

بمکـوژێ و بمبـڕێ بـە خەنـجەر و شـیر
وەک "ئیمـــامی" لـــە پێشـــی ڕاوەســـتم

گەردیگلان، ۱۳۱۷ی هەتاوی

---

بحر خفیف مسدس مخبون محذوف: فاعلاتن مفاعلن فعلن

# دەوای دڵی زارم

بــە گــوێی زەمانــە بگــا گیانــە ئــاخۆ هــاوارم؟
وەرەز لـــە ژیـــنم و بـــوونم، هەراس و بێـــزارم

تەمەن تەواو بووە، ئەممــا تەمەع وەکــوو خــۆی مــا
لــە بەژنـــی بەرز و لــە ئاکــاری جــوانی دڵــدارم

کەسێ کە پرسی لە من، پێی بڵێن: وەکوو مەجنوون
لــە زەرد و ماهـــە، لـــە هەرد و تەلانـــە ئاســـارم

ڕەفیقـــی جـــانەوەرانم، ئەســـیری بەنـــدی ئەویـــن
هەمیشــە ڕووتەڵــی نێــو بــاغ و دەشــت و کۆســارم

نەخۆشـــی دەردی ئەویـــن بـــێ‌عیلاج و دەرمـــانە
بەداخەوە نییـــــە چـــــارە و دەوای دڵـــــی زارم

دوو مـــاچی لێـــوە، ئەویـــش پێـــوە دەمـــرم و نـــابێ
نەســـیبی ئەو دڵـــی وا پـــڕ لـــە دەرد و ئـــازارم

"ئیمامی" هەروەکوو کوێر چاوەڕێیــە چــاوی هەبــێ
کەچـــی بەداخەوە هەر کـــوێرە چـــاوی بیمـــارم

قاقڵاوا، ١٣٥١ی هەتاوی

---

بحر مجتث مثمن مخبون محذوف: (مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن

# حەسرەتی دڵ

لــە ئــێش و حەســرەتی دڵ وەختــە بمــرم
پەڕ و بـــاڵ ڕەنگـــە بەم ڕۆژانـــە بگـــرم

لـــە هەرجـــێ دادەنیشـــم چـــۆڵ‌وهـــۆڵە
مەگەر کونـــدم، کـــە وا وێرانـــە قەبـــرم؟

لە نێـــو کـــۆڕی ئەدیبـــان ئەفســـەحێ بـــووم
کەچـــی ئێســـتاکە وا بـــێ‌نەزم و نەســـرم

وەکـــوو کەرویشـــکی لانـــەوخوارم، ئەممـــا
لــە پــێش چــاوان بەڵان وەک شــێر و بەبــرم

بــە حیلــە و فێــڵ و نەیرەنــگ بــووم، ئەوێستێ
چ بەســـتەزمان و بێ‌ئەفســـوون و مەکـــرم

ڕەئیســـــی خێڵـــی بێ‌چارانـــــە "کامیـــــل"
ئەنیســـی میحـــنەت و ئەنـــدووه و فەقـــرم

شــوکور زەیــقەت هوجــوومی کــردە لای مــن
حەدیســـی ئەحـــمەدە (ئەلفەقـــرو فەخـــر)م

مەڵــێن بــێ هیممەتــە؛ ڕیشــەم لە بــن هــات
زەعیفـــە تـــاقەتم، بێ‌تینـــە ســـەبرم

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

بەڵای لـــــیدا ژیـــــانی وا بـــــەزیلـــــەت
چ تـــاڵوتوونـــە چـــاوم، عـــومری خـــدرم

بـــە زینـــدوویی بـــە کـــاری مـــن نەهـــاتن
ڕەفیقـــــانم؛ مەگەر بمنێنـــــە قەبـــــرم

**قاقڵاوا، ١٣٥٠ی هەتاوی**

# زیارەتی سەروەر

ڕۆح ئەوا کەوتۆتــە پەرواز بــۆ حــوزووری دڵــبەرم
بێنەجـــێ ئەســـبابی پەروازم، کـــە بێبـــاڵ و پەڕم

بــۆ مەدینــە بــاڵی لێــکدا تەیــری دڵ، ڕۆیــی کــوتی:
گەر قەبــووڵم کــا، بــە ئــاڵاکەی ســەگی پێغەمــبەرم

هەر خەیــاڵم کــرد بچــم بــۆ زیــارەتی ئەو ســەروەرە
هــات نەســیمی ڕۆحپەروەر، عەتــری عــوود و عەنــبەرم

گەر لە ژێر چەتری شەفاعەت ڕێمنەکەی چ بکەم ئەمن؟
کــوێ بچــم کــوێر و فەقیــر، ناشــارەزایی مەحشــەرم

نــامەیی ئەعمــالی مــن مەخــوێنەوە، تێــیدا نیــیە
یەک کەلــیمەی چاکــە، ســەرتاپا ڕەشــە خــۆ دەفــتەرم

نیمــە غەیــری حــوببی ئــالی تــۆ، بە ئــالی تــۆ قەســەم
چــاوەڕێی ڕەحمــە "شــفیع المــذنبین"! چــاوی تەڕم

وا گەرووم وشـــکە لە تـــاوی حەســـرەتی ڕۆژی جەزا
موســـتەحەققی قەتــرە ئــاوی زەمــزەمم یــا کەوســـەرم

قاقڵاوا، ١٣٥٢ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# بەرز و نەوی

ئەوینم خـۆش دەویٚ چـونکی بـە هـۆی تـۆ هاتـە ئـامێزم
وەکـوو تاقانـە کـۆرپەی خۆشەویسـت باشـی دەپـارێزم

ئەوە ڕۆژ و شـەوی تەنیـایی هـاواڵی دڵـی زارم
بـە یـادی تـۆ، ئەوە مـایەی ژیـان و تیـنم و هێـزم

هەموو گۆشت و ڕەگ و پێستم ئەوین شێلای بە مل یەکدا
هەویـری خـۆتم و بمشـێلە شل‌شـل، گەرچـی بێ‌پێـزم

خەیـاڵی خـاوە گەر مـن زولفـی شـێت‌وپێتی تـۆ بێـنم
بڵـێم ڕامـی دەکەم بـۆ گەردنـم، نایێتـە پـارێزم

"ئیمـامی" خـۆ لـە ڕیـزی دڵـبەران بـاڵای بـە بـاڵا گـرت
بەڵام بەرز و نەوی کەوتـووین و هەرگیـز نایەتـە ڕێـزم

**قاقلاوا، ١٣٣٧ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# یاران ڕۆیشتن

فکری چ بکەم ئێستە لە پاش عـومری درێـژم؟
بڕوانە لـە دەسـت و سـەری لەرزۆکـم و گێـژم

ئەو ئارەقی دەڕژێ لە سەر و ڕووم بە حەقیقەت
دوای ڕۆیینـی یـاران هەمـوو جوانـاوە دەڕێـژم

یـاران کـە هەمـوو ڕۆیـن و مـن مـامەوە تەنیـا
جەرگ و دڵەکەم کونکونە، زووخـاوێ دەڕێـژم

بەو عومرەوە هەر قیبلەمی؛ گەر ڕوو نەکەمە تـۆ
بەو تـاقی دوو ئەبرۆیـە قەسـەم، باتڵـە نـوێژم

جێم لێژ بووە، پیـری لە سـەرم خێـوەتی هەڵـدا
هەرکـاتێ کـە بەربـوومەوە بڕوانـە لـە لێـژم

قاقڵاوا، ١٣٤٧ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن اخرب مكفوف محذوف: مفعول مفاعيل مفاعيل فعولن

# تەرازووی خێر و شەڕ

حیسابی خۆم دەکرد ئەمڕۆ لەگەڵ ئیحسان و عیسیانم
کەچی ئەم گەییە ئاسمان، ئەو لە عەرزە، ماڵی وێرانم

تەرازووی خێر و شەڕ ئێستا کەوایە ئەی خودا ڕەحمێ!
لە عیسیانم کەسر کە، بیخە تای خێرات و ئیحسانم

بەبێ تاعات و خێر و زیکر و فیکر و چاکە سەرشۆڕم
لە نێو عالەم چلۆن تا ئێستە ماوم، چۆن بوو، نازانم؟!

بەشەر میوانە یا ڕەب تۆی کە خاوەن سفرە وو خوانی!
بەڕێز گیراوە میوان و لەسەر ئەو سفرە میوانم

ئەگەر فەرمووت برۆ لەم سەرزەمینە، دەچمە ژێر عەرزی
بەڵام لەو ژێرزەمینەش‌دا تەوفەیلی خوانی سوڵتانم

بە ڕەحم و لوتفی تۆوە گەر بڕۆم باکم نییە هەرگیز
ئەگەرچی جێم لە ژێر عەرزە، لە سەر تەختی سولەیمانم

سەراپا نوورم و ڕووناک، ئەگەر لوتفت لەگەڵ من بێ
بە شەوق و زەوقەوە دەمرم، شەمی شامی غەریبانم

ئەگەر لوتفت نەبێ دوور بێ لە تاریکیی و تەنیایی
قرم دێت و دەڵێم: کوا یارەکانی جاری‌جارانم؟

لە ژێر باری گرانی مەعسیەت لەو گۆڕەدا "کامیل"
دەڵێ: ئەی خاک‌بەسەر خۆم! کوا ئەمن ئەو کۆڵە دەتوانم؟

**زەنبیل، ١٣٣٠ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# چرای خانەدان*

ئەوەند سەرگەرمی دەرد و میحنەت و ئەندووە و حیرمانم
نەپەرژام هەر لە لات بم، هەر فیداکەم ڕۆحم و گیانم

بە قوربانت بم و ڕۆحم فیدات بێ، گیانی شیرینم!
لە دەوریشت گەڕێم بۆ دەردی من تۆی مامە! دەرمانم

چرای بۆ خانەدان و جێگەیی فەخر و موباهاتی
خودا حیفزت بکا، مامە ئەمن بۆت قۆچی قوربانم!

وەرە سەرچاوەکەی چاوم، وەکوو جەیحوونی ماڵکاول
لە سەد جێ ناخودا خنکا بە گێژی وەختی گریانم

"ئیمامی" هەروەکوو دێوانە ڕێگەی چۆڵوهۆڵی گرت
لە تاو تۆ ئەی بە قوربانت دەبم، من خانەوێرانم!

شێخچۆپان، بەهاری ١٣٣٣ی هەتاوی

---

* بۆ خوالێخۆشبوو حاجی بابەشێخی مامی
بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# شەونم*

له عومری کورتی خۆی چاوم گلـه تـا سـەر دەکـا شـەونم
بــە لێــوی پێکەنینــی خونچــە چــاوی تەڕ دەکــا شــەونم

مەکە تۆخوا دەگەڵ وی باسی عـومری زۆر درێـژ ئەی گـوڵ
دڵــی ســافە، وتەی وا گیانــە زوو بــاوەڕ دەکــا شــەونم

فریــوی هەر هەوەســبازێ مەخــۆ ئەی تــازەگوڵ ئامــان!
سـبەینان ئـارەزووی یـارێکی دی و هاوسـەر دەکـا شـەونم

دەمــاخی بەرزە گەرچــی قەترەیێکــی نێــو گوڵووکــانە
شەو و ڕۆژ ڕوو لە ڕۆژ و مانگ و لای ئەختەر دەکا شـەونم

ئەسـیری ڕەنـگ و بـۆ نـابن ئەوانەی پـاک و دڵسـافن
شــەوانە تــا بەیــانی تــاق و تەنیــا ســەر دەکــا شــەونم

لە گـوڵزارێ کـە "کامیـل" خـونچەیی بیـر و خەیـاڵ ئەچنێ
لەسەر گوڵ هەر شـەرابی سـاف و ڕوحپەروەر دەکـا شـەونم

**بۆکان، ١٣٤٩ی هەتاوی**

---

* وەرگێڕاوی شێعری پەرتەوی کرماشانی
بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# وەکوو فەرهاد

بـە وتـاری وەکـوو قەنـد تـووتیی شەککەرشـکەنم
بە چپەی خۆش و ورنگ، بولبـولی بـاغ و چەمەنـم

بێموحابانـــــە و پەروا دەگەڕێـــــم و دەگـــــریم
شـــەمی هەر کـــۆڕم و پەروانەیـــی هەر ئەنجـــومەنم

گەنجـی تەبعـم کـە لە نێـو کـونجی دڵا دیـوەتەوە
هەمـــە ســـەرمایە، شـــوکور خـــاوەنی بەیتـــولحەزەنم

لــە ژیــان گەر نییــە بەنــد دەســتی شـکاوم، چـاوم!
چـــاوەڕێی خوێنـــدنی یاســـین و بڕینـــی کەفەنـــم

وەکوو فەرهادی بە بـا چـوو هەمـوو ڕەنـج و کـارم
بێســـتوونی خەمـــی دڵ هەر بـــە مـــوژان هەڵـــدەقەنم

سەری خۆی ناوە "ئیمامی" وەکوو مەجنـوونی هەژار
هەر دەڵـــێ شـــێتم و ئـــاوبردەیی دار و دەوەنـــم

کانیبەن، ١٣٣١ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# لە دەرکی مەیکەدە

لــە دەرکــی مەیــکەدە کەوڵــم بــە عەرزا داوە ئەی چــاوم!
دەســـا ســـاقی دەخیلـــتبم، کەرەمکـــە پیاڵـــە تـــا مـــاوم

بــە بــۆنەی پیــری مەیخانــە منــیش پیــر بــووم و لــێکەوتم
کەچـــی هەر جـــوانەمەرگیم پێدەمێنـــێ وەک دڵـــی لاوم

بە ئاوری دووری یارەب جەرگ و دڵ سووتاوە یەکجاری!
نەیـــاری بەدمەســـەب پێیوایـــە هێشـــتا مـــن نەبـــرژاوم

کــوتم ســەد جــار شــوکور بوومــە بەڵاگەردانــی بــاڵاکەی
وەکوو زەینــیش دەدەم هێشــتا، کــەچی ئەی داخەکەم مــاوم

لە بەحری سوێری فرمێسکی، "ئیمامی" بانــگ دەکــا: یــاران!
وەرن بـــۆ یـــارمەتی، ئێـــوە و خوداتـــان، تـــا نەخنکـــاوم

ئاقلاوا، ١٣٥٠ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# مافی گەل

لـــــە قـــــازانی خەمـــــتدا هەڵکـــــزاوم
وەکـــوو قاورمـــــە بـــــرژاوم، خـــــوراوم

لەبەر ئەو بەختـــــی سەرســـــەختی کلـــــۆڵم
لـــــە یـــــار و ئاشـــــنایان هەڵبـــــڕاوم

بـــە ئـــاوری دووری ئـــاخر بوومـــە قەقـــنەس
ئەگەر ڕاســـــتت دەوێ هێـــــز و هەنـــــاوم!

بـــــە زینـــــدوویی دەبیـــــنم حـــــاڵی مـــــردوو
بـــــە گۆڕەوشـــــاری دووریـــــت هەر نەمـــــاوم

وەرن ئەی ئاشـــــــنا بـــــــۆ دڵنەوایـــــــیم!
هەژارێکـــــــی کـــــــزۆڵەی دڵشـــــــکاوم

ئەرێ ئەی تـــــاوی هـــــــاوینی هەژاران!
بکـــــە ڕەحمـــــێ بـــــە ســـــەربەرگی دڕاوم

ئەگەر ســـەد چەل بـــە دووریشـــت بســـووتێم
لـــە دەس نـــادەم حەقـــی داگیـــر کـــراوم

دەڵـــێم هەر مـــــافی گەل دەرمـــــانی دەردە
ئەگەر چـــــی مـــــن بـــــە جـــــارێکی نەمـــــاوم

قاقڵاوا، ١٣٥١ی هەتاوی

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# چی بدرووم؟

مەزرەعەی خاڵیی خۆم دیوە من و داسی کول
ئەی خودایا بە چ دروێنە بکەم، چی بدرووم؟!

من لەبەر نانی بەهاریێ نییە ترس و لەرزم
هەر لە ئێستاوە لە تاو حاسڵی پاییز مردووم

فەسڵی هاوین و بەهار فەرقی نییە بۆ منی زار
هەموو کاتێ کە لە زاد خاڵییە ماڵ و کەندووم

هەرکەسێکە بە هیوای حاسڵی کەیفی خۆشە
من کە نیمە بە هیوای مەرحەمەتی تۆ زیندووم

تۆی کە ئاودێری هەموو دێمیی و ڕەززاقی هەموو
مار و مووریکی، بدە رزقی منیش تا زیندووم

با ئەوەند لێر و لەوێ سەر نەکوتم ڕۆژ و شەوێ
قوڕ لە دەرکت بە سەرا کەم، بکەوم، زۆر ماندووم

**قاقڵاوا، ١٣٤٣ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# بۆ هاوالّی ڕۆیشتوو

لەو وەخـــتەوە ڕۆیشـــتووە لام هێـــزی دوو ئەژنـــۆم
هـــاوڕەنگی گـــوڵی زەردم و هـــاودەنگی کـــزەی خـــۆم

پەروانەم و ئەممـــا نییـــە شـــەمعێ کـــە بســـووتێم
خەم بوو، کە وەراندوویە لـە مـن هەرچـی پەڕوپـۆم

یـــا بولبـــولم و نیمـــە گـــوڵی بـــاخ و لە داخـــان
لەم قـــــۆنجرە هێلانـــــەیە ویرانەیـــــە نـــــاڕۆم

هەســـــتە وەرەوە ڕۆحـــــی ڕەوان، مـــــایەیی ژیـــــنم!
هەرچێکـی خەتـای تۆیـە، ئەمـن دەیخەمـە ئەسـتۆم

"کامیـــــل" بە تەنـــــێ مـــــایەوە، ئەژنـــــۆیەتی هـــــاوالّ
بۆیـــە بـــە خەم و دەردەوە ئێســـتێ دەســـەوئەژنۆم

**قاقلاوا، ١٣٤١ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

# بێ‌پەڕ و باڵ

قەت بــــە غەمــــی کــــۆنەوە وەرنــــاکەوم
ڕۆژ و شــــەو و لەیــــل و نەهــــار ناســــرەوم

غوسسە لە ســەر غوسســە دەخــۆم بێ‌وچــان
گەرچــــی لە ژێــــر بــــاری گــــران نــــانەوم

ڕەحمــــی خــــودا زۆرە بــــە ئومێــــدی ئەو
ڕادەبــــــوێرم بەڵــــــێ ڕۆژ و شــــــەوم

غەم وەکــوو شــاهین بەرەوڕووم دێ بە قــین
ئەمنــــی هەژاریــــش بە خــــودا وەک کەوم

بــــێ‌پەڕ و بــــاڵ هاتمــــە بەردەســــتی ئەو
تــــاکوو بــــە یەکجــــاری بە لادا کەوم

جەمیان، ١٣٣٠ی هەتاوی

---

بحر سریع مسدس مطوی مکشوف: مفتعلن مفتعلن فاعلن

# دووریی یاران

ڕووڕەشــی دەرگــای خــودا و ئەحــمەدی موختــار خــۆم
هەر بــە تەنیــا موونســی نــاڵەی دڵــی پــڕزار خــۆم

پیاوی چاک دڵیان لـە شـوێنە و مـن بە دووی دڵدا دەچـم
شــێت و ماخوولیــا وو ســەرگەردان و بەدکــردار خــۆم

دڵ لــە ســەد جێگــە منــی بەرداوە، ڕەببــی بەرووبــێ
پــێچ و جینگڵمــە، کــوژاوی زەخــم و ژەهــری مــار خــۆم

یارەکــانی لــێ وەدوور خســتووم و ئێســتا پــڕ بــە دڵ
دێــم دەگەڵ دوژمــن کەوم، بێهــاودەم و بێیــار خــۆم

هەر تەریقێکــــی تەریـــــقەت نــــایەوێ دەمبـــــاتە وێ
ئەو وەبەر خەنــجەر کەوێ یــاڕەب، منــیش بیمــار خــۆم

**قاقڵاوا، ١٣٤٦ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# ڕەش و سپی

ڕووم ڕەش بووە بە مەعسیەت و مووم سپی بە خەم
چارەی ڕەش و سپی بکە، ئەی خاوەنی کەرەم!

لێبوردنە لە ڕووڕەشی وەک من، بە هۆی ئەوە
پیرێکی ڕیش سپیی و فەقیر، ڕوو لە تۆ دەکەم

دەرگات کراوە بۆ هەموو چاک و خراپەیەک
ڕێم لێ مەبەستە، تۆبی خوداییت، هەرچی هەم!

هێند شەرمەسار و چارەڕەشم، ڕۆژ و شەو خودا
هەروا دەسووتێ جەرگ و دڵی من بە چەشنی شەم

"کامیل" بیساتی جوان و جحێڵی بپێچەوە
کاتی سەفەر گەیشت و بڵێ تێشوویەک دەبەم

**قاقڵاوا، ۱۳۵۵ی هەتاوی**

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# پاڕانەوە

یـــاخوا! خـــودایی عەززەوەجەل، بێیـــە ســـەر کەرەم
سەر لوتف و عەفوو و مەرحەمەت ئەی ساحێبی نیعەم!

ئەو عالەمـــــە بە تـــۆوە دەنـــازن لە ســـــەر زەوی
ســــەربەرز و ســـــەرفیرازن و وا هەڵـــدەدەن عەلەم

دوورن لە ڕەحم و عەفووی تـۆ وانەی کـە سـەرنەوین
شـــێواو و شـــێت و پەرت و پەرێشـــان و دڵبەغەم

هەردەم بە فکـرێ ڕوو لـە دەری ڕەحمەتـی ئەتـۆم
ڕەحمـــێ بە حـــاڵی ئەمنـــی فەقیـر کـــە نەمـــاوە دەم

هەر چـــاوەڕێم هەمـــوو دەم و ژەم لـــوقمەیەک بەرم
تێـرم شـوکور بـە نیعمەتـی تـۆ، مـن لە کـاتی ژەم

شــــەرتە کـــــولێرەیێکی ئەتـــۆ گەورە بـــێ لە لام
هێنـدە کـە ئەو نواڵـە نەدەم مـن بـە مڵکـی جەم

"کامیـل" ببەخشـە تـۆ بـە کەرەم چونکـە هەر دەڵـێ
چـاوم لـە ڕەحـم و مەرحەمەتـی تۆیـە هەرچـی هەم

گەردیگلان، ١٣١٨ی هەتاوی

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# تاڵ و سوێری

کـــوتم بـــا ڕوو لـــه یـــار و ئاشـــنا کەم
کـــه بەشـــکم دەردی دڵ تـــۆزێ دەوا کەم

بەڵام یـــــارم نەیـــــار بـــــوو، ئاشناشـــــم
دەڵـــێ نەمـــدیوی، ناتناســـم بـــراکەم

کـــه تەوفیریـــان نییـــه چ بـــکەم خودایـــا
لەگەڵ بێگانـــه، یـــاران چـــۆن جیـــا کەم؟!

کـــه ڕوونـــاکی نییـــه بـــۆ مـــن لـــه هـــیچ لا
لـــه هەر شـــوێنێ، دەبـــێ هەر بـــێم و ڕا کەم

ئەمـــن هەر تـــاڵ و ســـوێریم دی لـــه دنیـــا
دەبـــێ کەی بـــێ خـــودا ڕۆژی جەزاکەم؟

کـــه جەرگـــم کونکونـــه، ئەوچەل لەوێڕا
دەبـــێ زووخـــاوی چەنـــد ســـاڵەم ڕەهـــا کەم

"ئیمـــامی" پاشـــی ئەنـــدامی له قیسچـــووی
دەڵـــێ هەر گیانـــه مـــاوە، بـــا فیـــدا کەم

**قاقڵاوا، ١٣٣٥ی هەتاوی**

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# ئازارەکەم*

کــوێ چــووە ئەمســاڵ بــرا خەمخــوارەکەم؟
ســەدهەزار خــۆزگەم بــە ســاڵی پــارەکەم!

چــۆنی خــۆشکەم دڵ، دەوای دەردم نیــیە
کـــۆڵەوارە خـــۆ دڵـــە زامـــدارەکەم!

ســەد حەکــیم چــووم و دەوای دەردم نەبــوو
بــێدەوا مــا کــاکی مــن ئــازارەکەم

خەڵفــی هیــوام بــێ لقوپــۆپ مــایەوە
وشــک و بێئــاوە گــوڵ و گــوڵزارەکەم

بــا "ئیمــامی" ڕەقهەڵــێ، بمــرێ لــە کێــو
بــــا نەمێنـــــێ تەرمەکەم، ئاســـــارەکەم

**قاقڵاوا، ١٣٥٣ی هەتاوی**

* بۆ وەفاتی کاکی
بحر رمل مسدس محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# چ بکەم؟

بە یادی شـەمعی ڕوخسـارێکی، دڵ ئیحیـا نەکەم چ بـکەم؟
بـە شـەوقێکی وەهـا چـاری شـەوی یەڵـدا نەکەم چ بـکەم؟

وەکوو مەجنوونی ماڵکـاول دەرودەشـت بۆتـە مەئـوای مـن
لە حەیفی عاقڵان خوم شـێتی ڕووی لەیـلا نەکەم چ بـکەم؟

لـــە کـــۆڕی عیشـــقبازانا نەمـــاوە قەدری ڕۆح و ســـەر
وەکوو پەروانە بۆ ڕووی ئەو بە ڕۆح سەودا نەکەم چ بـکەم؟

دەڵـێن یـار خـاکی بەرپێـی سـورمەیە، بـۆ چـاومی دێـنم
بـــە کـــوێرایی ڕەقیبـــی لامەزەب، ئەی وا نەکەم چ بـــکەم؟

بـــە شـــەرتێ بێتـــە لام، شـــەرتە ســـەرم دانـــێم لـــە پێنـــاوی
ئەگەر بۆ گاوگەردوون، ڕۆح و سەر ژێر پـا نەکەم چ بـکەم؟

لـــە دووری وی گەدام و دیتـــە لام وەک شـــا دەبیـــنم خـــۆم
لە چوون و هاتنی، خۆم وەک گەدا، وەک شا نەکەم چ بکەم؟

ئەگەر بـــا بـــۆنی تـــۆ بێنـــێ "ئیمـــامی" وا دەڵـــێ گیـــانە
کە من ڕۆح و سـەرم قوربـانی ڕێـگەی بـا نەکەم چ بـکەم؟

**گەردیگلان، ١٣٢٠ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# عەزیزی میسری دڵ*

دەڵێن گیراوە ئەوڕۆکە عەزیزی میسری دڵ، چ بکەم؟
لە پاش ئەو من لەگەڵ دڵ، شێتوپێتی وا بەکوڵ چ بکەم؟

ئەوە جوان و جحێڵ و پاک و خاوێن، بۆچی گیراوە!
منی پیر و پەشیمان و گونەهکار و خەجڵ چ بکەم؟

نەماوە باغ و ڕاغ و ڕەونەقی سەحرا، خودا مەرگێ
گوڵووکات چوو لەبەر ئەو، من لە دەشتی پڕ چقڵ چ بکەم،

لە باغێکدا کە گوڵ ڕۆیی بە تاراجی خەزان، جا من
وەکوو بولبول نەسووڕێم دار بە دار و چڵ بە چڵ چ بکەم؟

دەسم هێندە هەڵێنا بۆ تەمەننا، وشک و ڕەق ماوە
لەمەولا تاکوو ماوەی ژینمە بێدەست و پڵ چ بکەم؟

گرانە دەردی دووری، بەم لەشە چۆن هەڵگرم باری
زەعیف و پیر و بێهێز و قەوەت، بێشان و مل چ بکەم؟

"ئیمامی" هێندی خەم خوارد، عادەتی پێ گرتووە یارەب!
دەسووڕێ بێوچان، گێژە و لە دەردی چەرخوخول چ بکەم؟

قاقڵاوا، ۱۳۴۷ـ۴۸ی هەتاوی

---

* گیرانی حاجی سەید عومەری برازای
بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# دەروێشم و دڵڕێشم

دەروێشـــم و دڵڕێشـــم، دێـــوانەم و بـــێ لانەم
وەک کونـدم و هەڵنیشـتووی، کاولاشـم و وێـرانەم

بـــێدایکم و بێبـــابم، بێمـــام و بـــرا مـــاوم
لەم ئـــاخری عـــومرەمدا، وا دیـــارە کـــە تاقـــانەم

جێ و مەوتەنی من پرسن: هەر چۆلگە وو سارایە
مەجنـوونم و سـەرگەردان، لەو بەنـدەن و شـاخانەم

بێچـــارە و دامـــاوم، خەمبـــار و پەرێشـــانم
وەک بسـکی پەرێشـانم، هەروا بـە تەمـای شـانەم

تـا باشـی بلاوکـا لێـک، ئەنـدامی لەکـارکەوتووم
بـــابردەیی ئەو دەشـــت و ســـارا و بیابـــانەم

وەک بولبـولی نەسـرەوتوو، هەر تـاوە لـە دارێکـم
هەر کاتـــە لـــە بـــارێکم، بـــۆ ئەو دڵە بریـــانەم

کەوتوومە نەفەس‌تەنگی، وەک کەو لە قەفەس‌دا بـێ
لەشـــمە قەفەســـم ئەممـــا، بێئـــاوم و بـــێدانەم

بەو حـــاڵەتەوە ســـەیرە، عاشـــق بـــە قەد و بـــاڵام
کـــوژراوی بەر و بەرمـــوور، گیرۆدەیـــی لەرزانەم

---

بحر هزج مثمن اخرب: مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن

بەو بەندی ئەویستاکەم، مەعلووم بووە لای عالەم
نێو تاقمەیی هۆنەر، تەنیا کوڕ و تاقانەم

لای جانەوەران ئەمڕۆ، قەدرم فرەیە چونکە
وەک کاکی "ئیمامی" خۆم، لەو کێو و نزارانەم

**قاقڵاوا، ١٣٥٤ی هەتاوی**

# دەستی ماندوو و زگی برسی

دەبــــێ بگـــریم، بنــــاڵێنم، هەتــــا هەم
بــە دڵ بکــوڵێم و بگــریم هەروەکــوو شــەم
ببـــارێنم لـــە چـــاو فرمێســـکی گەرمـــم
لـــە داوێـــنم بـــکەم کۆشـــێ خەم و نەم

لە ســەر زگ چــۆنی دانــێم دەســتی مانــدوو!
زگـــی تێـــرم نییـــە، برســـیم هەمـــوو دەم

دەم و ژەم خەم دەخـــۆم و خەم دەنۆشـــم
بـــە خـــۆراک و بە خەو دڵخۆشـــی نـــاکەم

بەڵای لێـــدا لـــە خـــورد و خـــواردنی وا
وەڕەز بــووم مــن لــە ژینــی هێنــدە حەســتەم

چلـــۆن بفـــڕم، پەڕوپـــۆم هەڵوەریـــوە!
چلۆن خــۆڵ کەم بــە ســەردا، دەستە بەستەم!

بــە دەســتی کــێ بــکەم خــاکێ بــە ســەردا!
لـــە دەورەم جەغـــزی کێشـــاوە مـــژ و تەم

خودایـــە! تـــۆ حەکیمـــی بـــۆم بنێـــرە
دەوای دەردم، لـــە زۆر زۆر و لـــە کەم کەم

کەم و زۆرت لـــە لایـــە و زۆر و چـــاکە
هەموو ڕەحمــە و کەرەم، هەر لوتفــە ســەرجەم

قاقڵاوا، ١٣٤٧ی هەتاوی

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# با بسووتێم*

خۆشە پێم شەم بم، لە نێو جەرگ و دڵی شەودا بسووتێم
ببمە ڕووناکی ڕەفیقان، خۆشم هەر تەنیا بسووتێم

یا وەکوو مەجنوون بە ئاوری عیشقی لەیلا بێوەفاکەم
لەو کەژ و کێوانە وەک دێوانە وو شەیدا بسووتێم

زۆر لەمێژە ئارەزوومە شەوچرای مـن دەرکەوێ، تا
مـن وەکوو پەروانە خێرا بێم و بێپەروا بسووتێم

بۆم بدا دەست ساعەتێ لەیلا بگرمە باوەشی خۆم
پاش نەمانم با لە نێو ئاوری جەهەننەمدا بسووتێم

هەر لە تاوکەوتن هەتا ڕۆژپەڕ، شەوێ تاکوو بەیانی
وەک کەباب هەر قرچەقرچم بێ، بڵا هەروا بسووتێم

با لە نێو بۆتەی ئەویندا قاڵ ببم، بتوێمەوە باش
لێم گەڕێن تۆخوا، جەهەننەمم! با ببرژێم یا بسووتێم

نەک بڵێن ناقیس بوو، خاو بوو، هۆنەرێکی "کامیل"م من
با بەرابەر کا لەگەڵ ئیسمم موسەمما، با بسووتێم

**قاقڵاوا، ١٣٣٣ی هەتاوی**

---

* وەرگێڕاوی شیعری «عەلی‌ئەکبەر دولەفی»یە:

دوست دارم شمع باشم در دل شب‌ها بسوزم — روشنی بخشم میان جمع و خود تنها بسوزم
شمع باشم اشک بر خاکستر پروانه ریزم — یا سمندر گردم و در شعله بی‌پروا بسوزم
لاله‌ای تنها شوم در دامن صحرا بِرویم — کوه آتش گردم و در حسرت دریا بسوزم
اشک شبنم باشم و بر گونه‌ی گلها بلغزم — برق لبخندی شوم در غنچه‌ی لبها بسوزم
یا ز همت پر بسایم بر ثریا همچو عنقا — یا بسازم آن‌قدر با آتش دل تا بسوزم
ماه گردم در شب تار سیه‌روزان بتابم — شعله‌ی آهی شوم خود را ز سر تا پا بسوزم

بحر رمل مثمن سالم: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن

# من و شادی

فکر و حەواس و هۆش و عەقڵ، ڕێک بڕاوە لێم
ڕێگەی هومێد و سەبر و قەرار بەستراوە لێم

چت‌کرد خودا! لەگەڵ منی پیرەگەماڵی خۆت؟
شووشەی دڵم بە تیشەیی ئاهم شکاوە لێم

وەی‌وەی چ ئاورێکە کە بەربۆتە جەرگ و دل
هەر خاتراتی تۆیە دڵم وا شکاوە لێم

خۆشی مەگەر بە خەو بە دڵمدا بکا عبوور
ڕیشەی برایەتی من و شادی پساوە لێم

"کامیل"! مەکە ئەوەندە سکاڵا و دەردی دل
هەرگیز مەڵێ کە دەرکی خودا داخراوە لێم

رەتبیل، ١٣٣٠ی هەتاوی

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# یا کەریم

هەرچەند نەخۆشی عیشق و زەدەی پەنجەیـی پەریـم
هەرچەنـــدە بێمشـــوورم و هەرچەنـــدە سەرســـەریم

چونکـــە لـــە حـــاڵی خـــۆم وەڕەزم، مـــات و عـــاجزم
ماوم عەجەب لە ڕەحمی خـودا، بـۆچی مـن بەریـم؟

یـــاڕەب بە خـــاتری دڵـــی خاســـانی بێڕیـــات!
ڕەحمـــێ بـــە حـــاڵی زارم و وەزعـــی قەلەنـــدەریم

چونکی بە غەیری تۆ نییە کەس بگـرێ دەسـتی کەس
دەســـتی شـــکاو لەگەڵ دڵەکەم بگـــرە یـــاکەریم!

بمهێـــنە دەر لـــە گێژوخـــولی چەرخـــی چەپڕەوت
عـــاجز مەبـــە لـــە دڵپـــڕی ئەمـــن و لـــە زۆروەڕیـــم

گەردیگلان، ١٣١٩ی هەتاوی

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# ڕێبەری سیادەت*

بڕوانـــە کاروبـــاری خوداوەنـــدی ئیـــنس و جـــان
قودرەتنـــــوێنی بەرز و نەوی، عەرز و ئاســــــمان

چیکـرد قەزا کـە ئێمـە سەراسـیمە بـووین هەمـوو
بـۆ ئەم دڵـە پەرۆشـە هەمـوو بووینـە شـەمعدان

بـاکەی خەزان درەخـت و گـوڵی داڕنـی هەمـوو
سـەد بـاغەوان بـە پـووڵێ، نەمـا شـۆقی گوڵسـتان

دار و چنـار و عەرعەڕ و کـاجیش کـز و کوڵـۆڵ
سەرویش وەلەرزە کەوت و لە خـاکی چەمەن چەمـان

یـانی خەزانـــی هەردوو گـــوڵ و دڵ دەگەڵ یەکە
بۆتـە ڕەقیبـی بولبـوڵ و کەوتوونـە سـەر فوغـان

ئـــاە و فوغـــان و ناڵەیـــــە، هـــاوارە، نەوحەیە
شـینە، گرینـــە، سـۆز و گـودازە لـــە چیمەنـــان

ئەو زیبـــی گوڵســـتانی ئیـــرەم بـــۆچی ڕۆیـــوە؟
ئەو ڕێـــبەری ســـەیادەتە بـــۆچی بـــووە نیهـــان؟

---

* بۆ وەفاتی خوالێخۆشبوو حاجی بابەشێخ
بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

مزگەوت و حەوش و مەدرەسە چۆڵ بوو، نەما کەسی
بێ‌شـــەوق و زەوق و زەمزەمەیـــە ئێســـتە حوجرەکـــان

دەوری فەقـــێ بـــە نالّەیـــە، دەرســـی بـــە شـــیوەنە
ئەمـــڕۆ مەلاش بـــە لارەملـــی بـــۆی دەکـــا بەیـــان

"کامیـــل" فیراقـــی مامتـــە تـــۆی کـــردە کـــۆی زوخـــاڵ!
"اللـــە معـــک" وەدووی کەوە، بمـــرە بـــە ئـــێش و ژان

قاقڵاوا، ١٣٣٨ی هەتاوی

# پاییز

ماوم عەجەب لـە سـونعی خوداوەنـدی ئینس و جـان
قودرەتنـــــــویێنی بەرز و نەوی، عەرز و ئاســــــمان

جـــارێ زەمـــین دەکاتـــە ســـەما، مەوقیعـــی خەزان
بەرگـــی گوڵاڵـــەســـــوورە دەگاتـــە ســــتارەگان

گاهێ بە هەوری سوور و سپی و کەسک و ئاڵ و شـین
ڕەنگـــین دەکـــا میســـالی زەوی ڕوویـــی ئاســـمان

هێنـــدێ کـــە شـــاعیرن بـــە بەهـــارن عەلاقەمەنـــد
مـــن عاشـــقی خەزانـــم و مەفتـــوونی تێخـــزان

ئەو بەرگـــی وا بـــە دارەوە هاتۆتـــە خـــوارەوە
تۆمـــاری تێگەیشـــــتنە بـــۆ پیاوعـــــاقڵان

نووســـــراوە هەروەهـــا لە ســــەرەنجامی ژینتـــان
تـــا پیـــر نەبـــوون، بە دڵ بگـــرن قەدری خـــۆ، جەوان!

ئەو بەرگـــی دێتـــە خـــوارەوە خێـــرا بە بـــا دەچـــێ
یـــانی هەدەر دەبـــێ هەمـــوو عـــومرێ، وەکـــوو خەزان

دەنگـــی گەڵارژانـــە بـــە دەم بـــای خەزانەوە
بەو ڕازە باغەوانـــــە کەوا بۆتـــــە تەرجومــــــان

---

بحر مضارع مثمن اخرب مكفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعيل فاعلن

حـــاڵی دەکـــا بـــە ناڵـــە کـــە وەختـــی نەمـــاوە بـــاغ
ســـەبرێکی پێـــی دەڵـــێ کـــە نەمـــا قەدری بـــاغەوان

هەرواش بـــە ســـەبرە بولبـــولی بـــێ‌دڵ دەکـــا خەبەر
خاکـــت بە ســـەر بـــێ! هەســـتە بـــڕۆ تێکـــدە ئاشـــیان

عەتـــری نەمـــاوە ســـونبول و ڕەنگـــی نەمـــا چەمەن
سەروی سەهی بە جارێ لـە حەسـرەت چەمەن، چەمـان

ســـەرو و چنـــاری باغـــە بە دەم بـــای بەیـــانەوە
یەکتـــر دەگرنـــە باوەشـــێ وەک یـــاری میهرەبـــان

دەســـتی خەزان درەختـــی ڕنـــی و ڕووتـــی کـــردەوە
وەک ڕووی نیگـــاری ئێمـــە ســـپی و ســـافە، بێ‌گومـــان

دڵـــبەر کـــە دیتـــە بـــاغ و چەمەن، گـــوڵ لـــە خۆشـــییا
بەو بەرگـــە ســـەوز و ســـوورەوە دەیکاتـــە دوڕفشـــان

گـــوڵ، مووســـمی خەزانـــێ ـــ ئەگەر تـــێ‌بگەی ـ دەڵـــێ:
مەعلـوومی خـاس و عامـە: لە پـاش مەنـفەعەت، زیـان

"کامیـل" دڵـی چ خۆشـە لـە فەسـڵی خەزانـی گـوڵ
چـونکی گـوڵیش وەکـوو دڵـە، بـێ‌بەرگ و بێ‌نیشـان

گەردیگلان، ١٣١٩ی هەتاوی

# غەریبی خۆشەویست*

ئەی غەریبی خۆشەویست، ئەی دەربەدەر بۆ نیشتمان!
تۆ شەهیدی غوربەتی، ئەی کۆڵنەدەر بۆ نیشتمان

مەحشەرت هێنا بە مەرگی دڵتەزێنت، موهتەدی!
ماوەیێکی زۆر ئەتۆ مای بێخەبەر بۆ نیشتمان

ساڵی شەست و شەش بوو کۆچی ئاخرت کرد گیانەکەم!
ئاخری کۆڵت نەدا، بوویە سپەر بۆ نیشتمان

کەس نەما، ڕۆین هەموو، ئێمەش بە دووتاندا دەڕۆین
با بسووتێین بەو مەرامە، وشک و تەڕ بۆ نیشتمان

سەر لە سەر "ئاوات"ی خۆمان دادەنێین، پێمان دەڵێن:
ئافەرین، داتان لە دەست ڕێک ماڵ و سەر بۆ نیشتمان

قاقڵاوا، ١٣٦٦ی هەتاوی

---

* شینی کاک سەعدی موهتەدی لە دووروڵات

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# باسی سەر*

مەمکـی خـڕ کـردووە یـارم، دوو هەنـاری سـاوان
بـێ ئەوەی کەس دەسـی لـێدا، گەیـون بێتـاوان

کەس نەڵـێ دەس‌زەدەیـە بۆیـە وەهـا گەورە بـووە
ئەو وتە لای کوڕ و کیژ باسی سـەرە، ئەی ئامـان!

سـەروباڵان هەمـوو کیژانـی وڵات و سـەیرە
بەو هەمـوو بـاری دڵانـە کـە هەیانـە نەچەمـان!

سەروە بـاڵای گـوڵی مـن گەرچـی هەنـاری پێـوە
مەڵـێ پەیوەنـدە، تـکەی ماچـە لەوێدا، وا مـان

بۆ هەناوی منـی پـڕ مەیـنەت و خەم، دەرد و بەڵا
بـۆنی ئەو جووتـە هەنارانەیـە بوونـە دەرمـان

سـاز و ئامـادە، وەکـوو نـۆکەری گـوێڕادێرم
چاومە بەندی ئیشـارەی ئەوە، گـوێش بـۆ فەرمـان

چـاو لـە چـاوی دەبـڕم بەڵکـوو وەڵامـم داتـێ
گەرچی هەڵنایە ئەویش ئێستە لە ترس و شـەرمان

گەرچی شـەرمێونە، چـاوی لـە "ئیمـامی" داگـرت
کوتی هەڵنایە لە حانـد غەیـرە لـە ترسـی خزمـان

**قاقڵاوا، ١٣٥١ی هەتاوی**

---

* نالی: نەخل و ڕوممان پێکەوەن، یان باغەوان وەی کردووە
سەروی هێناوە لە سینو و بەی موتوربەی کردووە

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# دەردی کورد

دەردی کــوردم گرتــووە، چ بــکەم ئەمــن؟!
تەیــری بەخــتم مــردووە، چ بــکەم ئەمــن؟!

یەکنەبــوون و ڕێــکنەبوون و لێکپســان
ژەهری دووریم چێشــتووە، چ بــکەم ئەمــن؟!

بــاری یەکجــار زۆر گرانــی قەومەکەم
ئەمنــی یەکجــار خســتووە، چ بــکەم ئەمــن؟!

ڕیســی چەنــد ساڵەم، تەشیڕیســی زەمــان
پــێچەوانەی ڕســتووە، چ بــکەم ئەمــن؟!

یەکنەبــوونی دوو بــرای ئــازا و نەبەز
ڕێــی نەجــاتی بەســتووە، چ بــکەم ئەمــن؟!

وا نەیــاری بەدمەســەب بــۆ ئەو دووە
ســەد پلانــی ڕشــتووە، چ بــکەم ئەمــن؟!

هــۆنەری چەنــد ساڵەیی پیــر، بەخــتەکەی
هــاتووە و لێــی نوســتووە، چ بــکەم ئەمــن؟!

قاقڵاوا، ١٣٥٨ی هەتاوی

---

بحر رمل مسدس محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# ئیمامیش دێتن

وەرە نێــو بــاغ و نێــو گــوڵزار و چــیمەن وا لە ســەر ڕێــتن
هەڵاڵە و نێــرگس و شــەوبۆ و سوێســـنە خـــاکی بەر پێــتن

هەواخـواى بەژن و بـاڵات هەر بە تەنیـا مـن نەبـووم، تەنیـا
گەلـــێ لاوانـــی تـــازە پێگەیشـــتوو وەک ئەمـــن شـــێتن

هەزاران شێخ و شاب و شێت و ژیر، چاک و خراپ، ڕێکـی
هەموویـــان کوشـــتەیی لەرزانەکـــان و گـــوارەیی گـــوێتن

دەلەرزن هەروەکـــوو لەرزانە، بەنـــدن هەروەکـــوو گـــوارە
بە بـــۆنەی بەژن و بـــاڵات دیـــارە هـــاواڵی بەرێوجێـــتن

هەمــوو هــاتوونە ســەیری قیتوقۆزیــت، پیــر و لاو، ئەورۆ
بە قەولـــی ســـابڵاغی: وا "ئیمـــامی"ش حـــازرە و دێـــتن

**قاقڵاوا، ١٣٥٢ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# حاسڵی من

وەی کە هەر کاتێ شین ببێ گوڵی من
کە بپشکوێ، چ خۆش دەبێ دڵی من

ڕابوەستن هەتا دەگاتە بەهار
جا دەبینن گوڵیش لە سەر گڵی من

ئەوکەڕەت کیژوکاڵ لە من پرسن
تێدەگەن باش کە قەبرە مەنزڵی من

مەنزڵی چی؟ پڕە لە خیز و بەرد
پاکی هەر دڕکوداڵە باخەڵی من

کەسێ بچنێ گوڵێک لە سەر گۆڕم
هەڵدەچێ زوو لە دەستی پێکوڵی من

بەرهەمی ساڵیانەکەم پرسن
سەری خەرمان جەفایە حاسڵی من

من بە "ئاوات"ی خۆمەوە سووتام
داخۆ کەنگێ بلند بێ مەشقەڵی من

**قاقڵاوا، ١٣٦٣ی هەتاوی**

---

بحر خفیف مسدس مخبوب محذوف: فاعلاتن مفاعلن فعلن

# تینووی شەواو

خزمینـــــە! وەکـــۆبن کـــە ئەگەر عاقـــڵ و پیـــاون
بیـــرێ لـــە کەس‌وکـــاروو کـــە مـــردوون و نەمـــاون

کـــوا یـــار و ڕەفیـــق و کەس‌وکـــار، دایـــک و بـــابوو
چۆن ڕۆیین و کوێ چـوون و چ بـوو پـرش و بـڵاون؟

ئێـــوەش وەکـــوو ئەو عالەمـــە ڕۆیـــن لـــە ســـەفەردان
هەرکـــاتێکوو زانـــی کـــە لە نـــاو جەنگەیـــی داون

ئێســـتەش کـــە خەیـــاڵوو لـــە ســـەروپرچی بـــڵاوە
بـــاش تـــێ‌بگەن ئەو بیـــر و خەیاڵـــە هەمـــوو خـــاون

هەر گیـــا و گوڵووکـــاتێکی دەبیـــنن، هەمـــوو ئەعـــزان
دەســـت و ســـەر و پـــێ و چـــانەگە وو زارە شـــکاون

شین بوون لە زەوی و باغ و چەمەن، جـۆگە وو جۆبـار
ڕێـــک داغ لـــە دڵـــن، چونکـــە لـــە هـــاواڵی بـــڕاون

ئەو نێرگســـی بۆنخـــۆش کـــە ڕواون لـــە دەرودەشـــت
نێـــرگس نییـــە، بڕوانـــە؛ بـــە دیـــتن وەکـــوو چـــاون

چـــاوێ دەخشـــێنن لـــە کوڕوکـــاڵی وڵاتـــێ
یـــانی هەمـــوو پەتیـــارە وەکـــوو بلقـــی ســـەرئاون

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

ئەو ســـوورەگوڵی گەش کــە دیــارن لــە کەژ و کــۆ
گــوڵ نــین و هەمــوو خــوێنی گەشــی لاوە، ڕژاون

سوێسن کە لە پێش چاو گوڵی سەرسەوز و جـوان بـوو
زارێــــک و زمــــانێکی جــــوان بــــوون و دواون

ئەو ســـــەروە بەژنبەرزە و سەرســـــەوزە جـــــوانە
بەژن و قەد و بــــالاّن و بـــە ڕووســــووری ژیــــاون

ئەو بەژنــە بڵندانــە بە هــۆی ئــاوی ئەویــن بــوو
چەنــد مــاوە لــە بــاغ مــان و کەچــی هەر نەچەمــاون

بڕوانـــە وەنەوشـــە دەدرەوشــــێ بــــە دروشــــمێ
بســـکێکی پەرێشـــانە کـــە زۆر شـــانە کــــراون

بولبـول! مـن و تـۆ عاشـقی خـونچەی وەکـوو زاریـن
پێنــــاکەنێ بۆمــــان کــــە شــــەوێ ئــــاو نەدراون

ئەوشــۆ وەرە بــا پــێکەوە بگــرین لــە گوڵووکــات
چونکــە گــوڵی بــاغی هەمــوو تینــوویی شــەواون

**قاقڵاوا، ١٣٤٢ی هەتاوی**

# بای وادە

ئەوا بـــای وادە هـــات و ســـەوزە چـــیمەن
بەهەشـــتە گوڵشـــەن و ســـەحرا بـــە دیـــمەن

بەڵام بـــۆ مـــن چ بـــای وادە، چ پـــاییز
ڕەفیقـــان بـــانگی کـــاروانی هیـــوا کەن!

بەبـــێ ئـــازیزی دڵ خێـــڵ ڕەنـــجەڕۆیە
کەژاوەی ژینـــی تـــاڵ ناگاتـــە مەعـــدەن

بە خـۆی مـا دڵ، کـە دی نێـرگس لـە باخـان
بـــە چـــاوی جـــوانی دەڕوانێتـــە گوڵشـــەن

دڵـــم مـــا هەڵـــوەدا و مـــوبتەلای ئەو
چ بـێ مەڵبەنـد و جێگـا، مـاڵ و مەسـکەن

دڵـــم دۆش‌مـــا بە لای خەرمـــانی مەیـــنەت
بەبـــێ هـــاواڵ و داوەڵ، بـــێ‌کەس و شـــەن

بەبـــێ ئـــازیزی دڵ مەرگـــی "ئیمـــامی"
نزیکـــە، دا بلـــێ بـــێن گـــۆڕهەڵکەن

قاقڵاوا، ۱۳۶۰ی هەتاوی

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# ئاخ و سکاڵا

مــــن و بســـکی لـــە بەژنـــی بەرزی هــــاڵاین
وەکــــــوو یەک، دەردەداری بەژن و بــــــاڵاین

مەکەن لـــــۆمەی مـــــن و کەزیەی بـــــڵاوی
کــــە ئـــــاوبردەی جـــوانی و ئـــــاڵوواڵاین

دەم و چـــاوی ئەگەر ســـــوغرا وو کـــــوبڕان
لەگەڵ دڵ بۆیــــــە ســــــەرگەرمی موتــــاڵاین

لەگەڵ بولبـــول بـــە جـــۆش و کـــوڵ لـــە بـــاغی
بــــە ڕۆح وا موشــــــتەری بـــــازاڕی کـــــاڵاین

مــــن و کەزیەی وەکـــــوو مــــاری برینــــدار
"ئیمـــــامی" خــــاوەنی ئـــــاخ و ســــــکاڵاین!

**قاقڵاوا، ١٣٥٢ی هەتاوی**

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# یەکیەتی

کارگەر و ڕەنجبەر و وەرزێر و هەموو چین و دەچین
بـــۆ بەدەس گرتنـــی مـــافی گەلەکەم یەکدەکەویـــن

شـــەوی نەگـــبەت چـــووە، ڕۆژمـــان لـــە کەلـــی ئـــازادی
هـــاتەدەر، خاڵـــە دەســـا هەســـتە لـــە خەو، لابـــە ســـەرین

ســـەر لە ســـەر ڕێگەیـــی ئـــازادی نەچـــێ بـــاری لەشـــە
وەکـــوو گـــۆ بەر شـــەقی دەن چاکـــە، کوڕوکـــاڵی بەتـــین

دەس دەنـــە دەســـت و وەرن ئەی گەلـــی ئـــازا و نەبەز!
دەرفەتـــە، ئێســـتە لە نێـــو ئێمـــە نـــە ڕق مـــاوە نـــە قـــین

ژێرچەپۆکەی ئەم و ئەو هەر بەشـــی ئـــێمەی مەرد بـــوو
بـــا لەمەولاوە بـــە ئـــازادیی و سەربەســـتی بـــژین

یەکیەتـــی پـــێ‌دەوێ هەر میللەتـــێ هەســـتی ژین‌کـــا
وەرن ئەی کـــارگەر و وەرزێـــر و هەژار و مســـکین!

"کامیـــل" ئەمڕۆکـــە دەڵـــێ ڕۆژی هەلـــە، دەس دەگـــرین
شـــایی ئازادییـــە، بێ‌تـــرس و خەفەت هەڵـــدەپەڕین

قاقلاوا، ١٣٤١ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# پەروین*

ئەوی وا خاکی ڕەشی بۆتە سەرین
ئەوە ئەستێرەیی ئاسمان "پەروین"

گەرچی هەر تاڵی لە ڕۆژگاری چێشت
خۆ بەڵام هەرچی وتەی بوو شیرین

خاوەنی ئەم هەموو هۆنراوانە
سواڵکەرە ئێستە لەبۆ یەک یاسین

چاکە هاواڵی لەوی یادێ بکەن
دڵی بێ یارە، هەمیشە خەمگین

---

* شێعری پەروین ئیعتیسامییە:

اینکه خاک سیهش بالین است — اختر چرخ ادب، پروین است
گرچه جز تلخی از ایام ندید — هرچه خواهی، سخنش شیرین است
صاحب آنهمه گفتار، امروز — سائل فاتحه و یاسین است
دوستان به که ز وی یاد کنند — دل بی‌دوست دلی غمگین است
خاک در دیده بسی جان‌فرساست — سنگ بر سینه بسی سنگین است
بیند این بستر و عبرت گیرد — هرکه را چشم حقیقت‌بین است
هرکه باشی و ز هرجا برسی — آخرین منزل هستی این است
آدمی هرچه توانگر باشد — چو بدین نقطه رسد، مسکین است
اندر آنجا که قضا حمله کند — چاره تسلیم و ادب تمکین است
زادن و کشتن و پنهان کردن — دهر را رسم و ره دیرین است
خرم آن‌کس که در این محنت‌گاه — خاطری را سبب تسکین است

بحر رمل مسدس مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلن

خــــۆڵ لە ســــەر چــــاو بە خــــودا ناخۆشــــە
بەردی ســــەر ســــنگی گرنگــــە و ســــەنگین

هەرکەســــــی گەورە وو خــــــاوەن مــــــاڵە
هاتــــە ئەم جێگــــە فەقیــــرە و مســــکین

هەردەمــــی هــــات و ئەجەل هێرشــــی کــــرد
چــــارەیی دی نییــــە غەیــــری تەمکــــین

قاقڵاوا، ١٣٣٩ی هەتاوی

# وەعز و تەڵقین

مـــن و دڵ عاشـــقی هەر زەرق و بەرقـــین
بـــە پیـــریش گـــوێم نەدایـــە وەعـــز و تەڵقـــین

مەکـــە تـــۆ باســـی تۆبـــە، واعیـــزی پیـــر!
مـــن و دڵ خـــۆ لـــە ترســـی تـــۆ دەتـــۆقین

مـــن و یـــار هـــێن بـــە ســـەرگەرمی ژیـــاوین
لـــە خۆشـــی یەکتـــری پـــڕ شـــەوق و زەوقـــین

شـــوکور زســـتانی ئەمســـاڵ وەک بەهـــار بـــوو
هەمـــــوو کانیاوەکـــــانی کێـــــوی تـــــۆقین

بـــە کـــوێری دوژمـــنم، ڕێوبـــان کـــراوە
هەمـــوو جیَژوانەکـــان هەر مـــان و بـــاقین

کـــە ڕقئەســـــتوورە مارزبـــــاب، ڕەقیـــــبم
بـــڵا هەڵماســـــێ وەک ماســـــی لە بەر قـــین

"ئیمـــامی" ئەوکەرەت ئەو دەســـتە شـــێعرەت!
لە ســـەر وەزن و لە ســـەر شـــێوەی عێـــراقین

**گەردیگلان، ۱۳۲۹ی هەتاوی**

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# یەکگرتن

ڕاپەڕیــن، یەک دەکەویــن، یەک بکەویــن ســەردەکەوین
گەلی ئێمەش هەمــوو خوازیــاری هەوا و ئــاو و زەویــن

کوردە زۆر جــار بــووە کەم زۆری وەســەر زۆر بــکەوێ
قەت مەڵـــێ دوژمنـــی مە زۆرە، بەڵام ئــێمە کەمـــین

گەر لە ســەر کلــکە لەگەڵ مە، وەکــوو مــاری جەنگــی
لێـــی مەترســـە، فڕوفیشـــاڵە، لە ڕێـــی دانـــێ کەمـــین

خەوی زۆر بوو گەلی ئێمەی لە قوڕی غەفـڵەت خست
مەرد و مەردانە وەرن، تــۆبی خـــودا، بـــا نەخەویـــن

هەر شـــەوە بــۆ مە بــرا، کــاتی گەمـــارۆی دوژمـــن
تـــا بزانـــێ نەتەوی، ئــێمە هەمـــوو پیـــاوی شـــەوین

گەرچـــی ڕێ ئەســـتەمە، پــڕ دڕکە، ئەگەر تێکــڕا بـــین
لەو هەمـــوو بەنـــدەن و شـــاخ و چـــڕە زوو تێـــدەپەڕین

گەر هەڵـــۆیە نەتەوی، بـــۆتە کوڵـــۆی ســـەر ڕێمـــان
ئەو کە خاوەن گوڕ و دەنـدووکە، مەگەر ئـێمە کەویـن؟

پەڕوپـــــۆی هەڵـــــدەوەرێنێ نەتەوەی کـــــاوە بـــــرا!
گەل ئەگەر یەککەوێ، داگیرکەرەکــان نەخشـــی زەویـــن

شـــووڵی باریـــک کە هەمـــوو پــێکەوە بایـــدەن، پـــتەون
بـــا هەمـــوو دەســـت بگـــرین پـــێکەوە، تـــاکوو نەنەویـــن

**قاقڵاوا، ۱۳۵۵ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# بێشکەی شکاو

مــن فەقیرێکــی ڕەش‌وڕووت و لــە دەرکــان دەرکــراو
تــۆش خـــودایێکی کەریـــم و دەرکـــە ئـــاواڵەکراو

ڕووم لە دەرکی تۆیە ئەی خاوەن کەرەم، سا لـوقمەیەک
شەرمەســـار و ڕووڕەش و زۆر مــل‌کەچ و ئابڕووتکــاو

هەرچــی ئەعزامــە لەبەریەک‌چــوو، لە بەر دەرد و غەمــم
دار و پەردووی لێــک‌ترازاوە وەکــوو بێشــکەی شــکاو

ســـیپەلاک و جەرگ و دڵ، هێـــز و هەنـــاوم لێ‌بـــڕا
قـــالبێکی چۆڵ‌وهـــۆڵ وەک مـــاڵی هـــیچ تێـــدانەماو

تــۆ عەجایــب مــای "ئیمــامی" بەو هەمــوو دەردانەوە!
کێیــە ئەمڕۆکــە وەکــوو تــۆ بەنــدی جەرگ و دڵپســاو؟

قاقلاوا، ۱۳۵۵ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# دوورکەوتنەوە

تــۆ چوویــە وڵاتــێ کــە نەبیــنم ئەســەری تــۆ!
دوور کەوتــی لــە مــن تــاکوو نەبیســتم خەبەری تــۆ

ئەی نــووری دڵ و قــووەتی ئەژنــۆم، بەســە دووری!
ڕۆحـــم وەکـــوو پەروانـــە گەڕا دەوروبەری تـــۆ

ئەو حاڵەت و هۆش و هونەری ئەودەمــە مــن بــووم
ئێســتێ نییــە تــاقی، هەمــوو قوربــانی ســەری تــۆ

دڵ هەروەکــوو عەودالــە لــە دووت، تاڵــە ژیــانی
چــاوم وەکــوو ئاوپاشــە لــە ڕێگــە و گــوزەری تــۆ

ڕەحمــێ بکــە بەم ڕیشــە ســپی و چــاوە پــڕ ئــاوە
نەتزانــی لــە دڵ حەســتەمە ئــاخر ســەفەری تــۆ؟

ئەی من بە فیــدای ڕۆیــن و کــۆچ و ســەفەرت بــم!
چـــت کردبـــوو ئـــاخر کـــە وەهـــا دەربەدەری تـــۆ

هەســـتە وەرەوە، گیانـــە وەباڵـــت بـــە ملـــی مـــن
وەســتۆ دەگــرم شــەرتە هەمــوو خێــر و شــەڕی تــۆ

قاقڵاوا، ١٣٤٢ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

# تورجانی خرۆشاو*

عــالم و عــامی لە تورجــانێ وەخــرِ بــوون بــێدرۆ
کەوتــنە شــادیی و رەقــس و هەڵــپەڕین و هــاتوچۆ

پیــر و جــوان، شــێخ و مەلا هــاتوونە رەقسـین و سـەما
پاکی لەرزی عەرز و حەوش و بـان و هەیـوان و سـەکۆ

من کوتم: یارەب! مەگەر چی بوو بە دەستی جەم هەموو
تــایفە رێکــی لە دارولعیلمــی شــێخا بــوون وەکــۆ

پێــی کــوتم عەقڵـم کە شــەربەتخۆری و دڵخۆشــییە
بۆ دەکەویە سەر خەیاڵ و بەحـری فکـر و جوسـتوجۆ

ئەرشــەدی ئەولاد و ســاحەبکاری پــرِ عەقــڵ و هــونەر
مونتەهــا بــوو، ئێســتە زامــی کــۆنی دوژمــن هــاتە سـۆ

کــاعەزیز! تەنیــا لە نێــو ئــێمە ئەتــۆ گــۆت بــردە دەر
بەو ئیجازەی تۆیە چـا بـوو جەهلـی جەمعـێ بـوو پەرۆ

ئیرســی بــابی خــۆتە عـیلم و جەوهەر و فەزڵ و هــونەر
بیــرِفێنە زوو بە چــاکی، هەروەکــوو بــاز و هەڵــۆ

---

* بە بۆنەی ئیجازە وەرگرتنی سەید عەزیزی تورجانی
بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

بەم هەرا و جەمعیــیەت و خۆشــیی و بەزم و شــادییە
دوژمنـــی ئــێمە تەماشـــاکە هەمــوو بــوون ڕەنــجەڕۆ

هەرکەسێ شێخی نەوێ، کۆستی کەوێ، قەت نەسرەوێ
یــا ڕەبــی خــوار و زەلیــل و ڕەنــجەڕۆ بێــت و تــڕۆ

ئەم هەمــوو خۆشــیی و بەزمە، بــۆ ئیجازەنــامە بــوو
یــا خــودا مــامە، موبــارەک بــێ بە دڵخۆشــی لە تــۆ!

هــــۆنەرێکی زۆر زەبەردەســــتە "ئیمــــامی" نــــۆکەرت
بــۆیە ڕیســـی ڕێــکوپێکە، قەت نەبــوو بێتــار و پــۆ

# چش لەم و لەو

ئەی خـــالیقی ڕۆژ و شـــەو! ڕۆژم ڕەشـــە هەروەک شـــەو
شـــەو هەر لــە خەیـــاڵی ئەم، ڕۆژیـــش بـــە هومێـــدی ئەو

تـــا کەی بە هومێـــدی ئەو، تـــا کەی بـــە خەیـــاڵی ئەم؟
یارەب ئەو و ئەم بەس بێ! هەم چش لەم و هەم چـش لەو

ڕۆژ و شـــەوی عـــومری مـــن، پـــاکی بـــە عەبەس ڕۆیـــی
ڕۆژ خواردنـــە فکـــری مـــن، شـــەو هەر بـــە خەیـــاڵی خەو

ئەم عالەمـــە فـــانی بـــوو، ئیتـــر بـــە خەیـــاڵی چـــی؟
کـــوا شـــاه ســـولەیمان و ئەســـکەندەر و کەیخوســـرەو؟

هەســـتە بـــڕۆ بەردەرکـــی خاســـانی خـــودا "کامیـــل"!
بمـــرە، کـــە لـــە پـــاش فەوتـــت هەر عیشـــقە دەدا پـــڕتەو

**قاقڵاوا، ١٣٦٠ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن اخرب: مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن

# ئەوشۆ

چ خـــۆش بەزمێکـــە بەزمـــی یـــارە ئەوشـــۆ
دڵـــــم جێ‌ڕاوگەیـــــی دڵـــــدارە ئەوشـــــۆ

دەڵـــێن یـــارم لـــە شـــەودا دێ و لـــە خەودا
لـــــە بێـــــداری دڵـــــم بێـــــزارە ئەوشـــــۆ

ســـەبا، مـــوژدەی بەرە بـــۆ شـــاری عوششـــاق!
کـــە مەجلـــیس خـــۆش و بێ‌ئەغیـــارە ئەوشـــۆ

لـــە نێـــو پێچ‌پێچـــی زولفـــی، بولبـــولی دڵ
خەریکـــە دێ و دەچـــێ، ســـەییارە ئەوشـــۆ

گـــوڵی دڵ ســـیس و پەژمـــوردە و چەمیبـــوو
بـــە وەســـڵی یـــاری شـــەونمدارە ئەوشـــۆ

وەکـــوو یۆســـف لـــە زینـــدانێ وەدەرکەوت
بـــە ســـەد عیـــززەت عەزیـــزی شـــارە ئەوشـــۆ

لـــە وێـــرانەی دڵـــمدا ئێســـتە دڵـــدار
بـــەبێ مینـــنەت شـــوکور میعمـــارە ئەوشـــۆ

تەماشـــا قافیـــە و شـــێعرم لـــە شـــۆقی
چ مەوزوونـــە و چ چابوک‌ســـوارە ئەوشـــۆ

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

لـــه جەولانـــگەی ســـەنا و تـــاریفی یـــارم
قەڵەم ئەســـــپێکی تەعلـــــیمداره ئەوشــــۆ

ئەگەر مـــوو بــــێ، لغـــاوی ناپســـێنێ
ئەگەرچـــی کـــارەکەی هەر غـــاره ئەوشـــۆ

ڕەقیـــب زانـــی: بـــه کـــار نایـــه "ئیمـــامی"
لـــه خـــۆی بێـــزاره، تارومـــاره ئەوشـــۆ

عەســـەس بێکـــاره مـــا، دەرچـــوو لـــه مەیـــدان
کـــوتی ســـەردەرکه، مـــاڵ بســـیاره ئەوشـــۆ

"ئیمـــامی"ش وا لـــه ســـایەی قەنـــدی لێـــوت
وەکـــوو تـــووتی شـــەکەرگوفتاره ئەوشـــۆ

**قاقڵاوا، ١٣٣٥ی هەتاوی**

# کزەبای شەماڵ

بە سروەت پێدەڵێم چاوم، کزەی دێ بای شەماڵ ئەوشۆ
چزەی دێ جەرگی برژاوم، بەبێ پۆلوو و زوخاڵ ئەوشــۆ

ئەوا تیپی بەهاری دەست بــە نیــزە چوونــە ســەر بەفــرێ
شــکا پشــتی کلــیلەی قوڕبەســەر وەک پیــرەزاڵ ئەوشــۆ

سەراسەر فەرشە چیمەن بۆ قودوومی بووکی گوڵ، بــۆیە
زمانی گرتووە هەر چەشــنی تــووتی، کونــدە لاڵ ئەوشــۆ

بە تەشــریفی شــنە، شــەوبۆ و نێــرگس پــاکی پشــکووتن
لە خۆشیان بولبول و قومری دەکەونە قیــلوقــاڵ ئەوشــۆ

کوڕوکاڵ دەمبەخەنــدەن، کیژوکــاڵ پــڕ عیشــوە وو نــازن
بزەی دێ غەمزە وو ڕەمز و ئیشارەی چاوی کاڵ ئەوشــۆ

ئەوا هەر چاوەڕێیــە نێرگســی شــەهلا بــە تەنیــایی
بە جارێ بوو سپی چاوی بــە ئومێــدی ویســاڵ ئەوشــۆ

بە دەنگی بولبول و قومری، تەماشــا دڵ چلــۆن دەگــری!
دەڵــێ بگــرن بــە دڵ قەدری، جەمــاڵی کیژۆکــاڵ ئەوشــۆ

"ئیمامی"ش هەروەکوو بولبول بە هیوای پێکەنینــی گــوڵ
دەناڵێنێ لە سەر هەر چڵ، بە یادی خەتوخــاڵ ئەوشــۆ

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# شەو

نووری ڕوخسارت وەدەرخە، دەردی بێدەرمانە شەو
زوڵمەتی زولفت لە سەر ڕووتە، لە ڕۆژ میوانە شەو

دوێ، شوکور مەردانە من ڕێم بردە ناو زولفی ڕەشی
تا بزانن خەڵکی مولکی دڵ، قەڵای مێردانە شەو

هەر لە مەغریب تا بەیانی بێوچان دێت و دەچێ
هەر لە دووی خورشیدی خاوەر وێڵ و سەرگەردانە شەو

کوێر و نابینایە ئێستا ئەو لە داخی ڕۆژی ڕووت
بۆیە ڕەشپۆش و فەقیر و مات و بەستەزمانە شەو

قەدری شەو چا بگرە چاوم! شەمع و پەروانە دەڵێن
سۆز و گریەی شەمع هەر شەو، سووتنی پەروانە شەو

عاشق و مەعشووق لە ڕۆژدا خۆ دەپارێزن لە خەڵک
گەر پەنای چاکت دەوێ بۆ ئەو دووە، بڕوانە شەو

هەستە "کامیل"، بەسیە بێداری، بڕۆ لێیوەرکەوە!
تا وڵات بێدەنگ و باسە و تا لە ڕۆژ میوانە شەو

**قاقڵاوا، ١٣٤٥ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# سەودا

بە یـــادی دڵـــبەری ســـەوداگەرم ویـــرانە ئـــاوا بـــوو
هەمـــوو بـــازارِ و شـــاری دڵ کەوا بێ‌شـــۆق و ســـەودا بـــوو

گـــلەی پـــێم هاتـــە ســـەر، چونکـــە ســـەرم دانـــا لـــە پێنـــاوی
بە سەر چووم، ڕاستە ئەم ســـەودایە ســـەوداێکی بێ‌جـــا بـــوو

بە ڕەمزی چاوی مەســـتی خـــۆت ئیشـــارێکی لـــە دڵ فەرمـــوو
بزانـــە بـــۆچی بێ‌بـــادە ئەوەنـــدە شـــێت و شـــەیدا بـــوو

نییانـــە ڕەغبەتـــی شـــیرینی مەســـتان، ڕۆحـــی شـــیرینم
بـــە مـــاچ وەرنـــاگرن لـــێم، بەزمـــی ئێمـــە بۆیـــە ســـا وا بـــوو

کـــە یـــادی دڵـــبەرم تەشـــریفی بـــردە نـــاو دڵـــی زارم
لە بەینی عەقڵ و عیشقمدا لـــە ســـەر ئەو شـــۆخە دەعـــوا بـــوو

ئەمن کێم؟ دڵ لە قیس‌چوو؛ کوێ دەچم؟ سارای جنوون؛ بۆچی؟
لەگەڵ مەجنوون ڕەفیـــق بـــم، تـــا بـــزانم چـــۆن لـــە لەیـــلا بـــوو

"ئیمامی" ماوەیەک بوو مەشقی ڕەمـــزی چـــاوی مەســـتی کـــرد
لەپڕ مەستی بە سەریا هات و سست و پەست و ڕیـــسوا بـــوو

قاقلاوا،۱۳۳۵ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# باڵای مەوزوون

نــە تەنیــا بەنــدەیی بــاڵایی مەوزوونــت ســنەوبەر بــوو
عەلەم بوو، سەرو بوو، هەم نەیشەکەر بوو، نەخلی نەوبەر بــوو

نە تەنیا گوڵ خەجاڵەت ما، لـە ڕووی وا جـوانی تـۆ چاوم!
کەتـان بــوو، پەڕنیــان بــوو، گیـانەکەم دیبـایی ئەخـزەر بــوو

نە تەنیـا شـۆر و غەوغـا بـوو، کـە دویٚ تەشـریفی تـۆ ڕۆیـی
بەڵا بوو، فیتنە بـوو، ئاشـووب بـوو، غەوغـایی مەحشـەر بـوو

نــە تەنیـا یاســەمەن بــوو مەســخەرەی سـیمین بەنـاگوێی تـۆ
سەمەن بوو، نەستەرەن بوو، لالە بوو، نەسرین و شەشـپەڕ بـوو

نــە تەنیــا هەر ڕەقیــب بــوو کــامڕان لەو زولفــە پــڕ چیــنەت
سەبا بـوو، شـانە بـوو، مەششـاتە بـوو، عەنبەرچەیـی زەڕ بـوو

نــە تەنیــا هەر "ئیمــامی" مــات و مەبهــووتی جەماڵــت بــوو
فوغان بوو، ناڵە بـوو، خـوێنی جـگەر بـوو، دیـدەیی تەڕ بـوو

**گەردیگلان، ١٣٢٢ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# غەزەلی ناقیس*

چ شەوێ بوو شەوی جومعە، کـە شـەوی زەلزەلـە بـوو!
شەوی سۆز و شـەوی پڕسـۆز و هەرا و مەشـغەلە بـوو!

چ شەوێ بوو کـە چـرای عەرزی بـە فرمێسـکی فەلەک
هەموو کـووژانەوە، مەجلـیس هەمـوو بێمەشـعەلە بـوو!

مەشـعەلی سـوختەدڵان گەییـە فەلەک، بۆیـە لەوێـش
دەستەدەسـتە مەلەکـیش هاتنـە عەزا، هەلهەلـە بـوو

خـۆم و هەرچـی هەمـە کـردم بـە فیـدای و ئەجەلـیش
کەچی تەئخیـری نەکـرد، سـەیری چ بێحەوسـەلە بـوو!

دڵـی ئێمـە و دڵـی عـالەم وەکـوو یەک ئـاگری گـرت
چاکـــە لەم مەرحەلەدا دڵ لـــە دڵان بێگلـــە بـــوو

هێنـــد پەرێشـــانە دڵـــی خـــانەخرابی "کامیـــل"
غەزەلـــی ناقیســـە، ئەمجـــارە بیـــوورن پەلە بـــوو

قاقڵاوا، ١٣٣٨ی هەتاوی

---

* بۆ کۆچی دوایی حاجی بابەشێخی مامی

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# کاتی بەهارە

کـاتی بەهـارە چـاوەکەم! بـێ بچینـە بـاغی دووبەدوو
گوڵ بچنین بە هەردوو دەس، بێینـە سـەما و جوسـتوجوو

سـاقی بـە هەڵپەڕیـنەوە دێـت و دەچـێ لە نێـو چەمەن
خونچـە بـە پێکەنیـنەوە دڵ دەڕفێنـێ زوو بـە زوو

بولبول و قومری هەر تەڕەف سازی تەڕەب دەکەن، کەچی
لـە شـاخی گـوڵ، لـە داخـی دڵ خـۆ دەنـوێنێ کونـدەبوو

عەرعەڕ و سـەرو و نـارەوەن پـاکی بـە دەم نەسـیمەوە
بە ڕەقس و شـەوق و زەوقەوە دێـن و دەچـن بـە ئـارەزوو

ئەدەب دڕا دەفـی لەبەر تەرەب لـە بـاخ و گوڵشـەنا
لـە لای بەشـەر لەبـۆ دەوا نەمـا حەیـا وو ئـابڕوو

خۆشـییە، کەیفـە، شـادییە، بەزمـە، هەرایـە، چـۆپییە
بە عەشقی بووکی بولبولە، خونچە کـە بووکـە، دڵ خەسـوو

ڕاز و نیـازی دڵ دەکەن بولبـول و قـومری پـێکەوە
هەردوو بە فکری بیکرەوە، خونچە بە یەک دەدەن بـە شـوو

هەر بـەتەنـێ "ئیمـامی"یـە بـێبەش و بەهـرە مـایەوە
خەرمەنی خەم بە بـا دەدا، دەنکـی ئەسـەف دەکـا بـە تـوو

بۆکان ١٣٤٦ی هەتاوی

---

بحر رجز مثمن مطوی مخبون: مفتعلن مفاعلن// مفتعلن مفاعلن

# گوڵبەریشم چوو*

هەموو ساڵێ خەزانی گوڵ بوو بۆ من، گوڵبەریشم چوو
گوڵم چوو، سونبولیشم چوو، دڵم چوو، دڵبەریشم چوو

چەمەن تەنیا گوڵی چوو، من بە جارێ ماڵی وێرانم
کەسم چوو، سەروەریشم چوو، مورەببی و رێبەریشم چوو

لە باغا بەرگی گوڵ چووبوو بە تاراجی خەزان، بۆ من
قەڵەم چوو، نامە چوو، تەبعی رەوان چوو، دەفتەریشم چوو

عەجایب پاییزێ بوو، شەختەکەی جەرگ و دڵی بردم
دڵ و جەرگ و هەناو و ماڵ و حاڵ و هەم سەریشم چوو

خەڵک شووشەی گوڵی دەشکێت و من شووشەی دڵم، چ بکەم
خەڵک سووسەنبەری دەڕژێت و من مووعەنبەریشم چوو

خەڵک خانوێکی دنیایی دەڕووخێ مات و حەیرانە
ئەمن ئەی خاکبەسەر خۆم، مزگەوت، هەم مینبەریشم چوو

قاقڵاوا، پاییزی ۱۳۳۸ی هەتاوی

---

* بۆ وەفاتی حاجی بابەشێخی مامی

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# بەوری بەیان

لەگەڵ دوژمــن "ئیمــامی"! هەروەکــوو شــێری ژیــان وابە
لە پــێش پڕدانیـــان ڕاوەســـتە، وەک بەوری بەیـــان وابە

بە داخ و دەردەوە بــۆچی چەمیــوی؟ ئــاهەکەت تیــرە
لەگەڵ خەڵکــی زەمانــە ڕاســت وەکــوو تیــری کەوان وابە

ئەگەرچی هەروەکوو کیسەڵ لـە قـاپێلکی خەمـا خەوتـووی
لــە کالانـــا مەوێســـتە هەروەکـــوو تیغـــی دەبـــان وابە

لــە ڕیــزی عاشــقانیش هەروەکــوو مەجنــوونی ماڵکـاول
لە دووی خێــڵ و کەژاوەی لەیلــی هەروەک ســارەوان وابە

لە عیلمی سـێحر و نەیرەنـگ و فسـوون قەیناکـە تێکۆشـە
هەتا پێش چاوی دوژمن وەک شک و وەهم و گومـان وابە

بــە گەرمــی ڕابــوێرە شــەو بە یــادی دڵــبەرت "کامیــل"!
لەگەڵ ناڕاســـتەکان ســـارد وەک نەســـیمی بەربەیـــان وابە

بۆکان، ١٣٥٠ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# خەت و خاڵ

خەت و خاڵ و زولف و برژۆڵ لە نزیکی چاوی مەستە
هەموو زار و جەستە خەستە، هەموو شێت و دەستبەستە

یەکێ دوور و یەک نزیکە، یەکێ نزم و یەک بڵندە
هەموو کەوتوو، ڕەوتوو، سەرسام، وەکوو لەشکری شکەستە

چ قەبیلەیێکی شۆخن قوڵەزەنگی خێڵی لەیلی
کە بە هۆی ئەوینی مەجنوون دەخزێن بە دەستەدەستە

دڵی ڕووتوقووتی عاشق بە هومێدی ڕۆژی کوڵمە
کە بزانێ عاشقی ڕووی ئەوە ڕووت و ڕۆژپەرستە

بە دزی دەخاتە ئەستۆ سەری زولفی عاشقی ڕووی
کە دەزانێ خۆشمەرەز بووم، چ جوانی کردە ڕستە

هەموو عاشقانی زاری بە قسێکی خۆش دەڕەقسن
لە دەمی ئەگەر ببیسن، چ گرنگە ئەو مەبەستە

ئەمنیش دڵم لەوێ بوو بە ئیشارەیێکی چاوی
هەڵیگرت و بردی، فەرمووی دە "ئیمامی" هەستە بەستە!

گەردیگلان، ۱۳۵۰ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن مشکول: فعلات فاعلاتن// فعلات فاعلاتن

# داخوازی ئیمداد

نــزام بــۆ تۆیــە ڕەببەلبەیــت! دڵــم داخــوازی ئیمــدادە
دەزانـــی عەبــدی خــۆت ئێســتاکە وا بێتۆشـــە و زادە

لە سەر ڕێگـایەکی پڕتـرس و خەوف و دڕکوداڵـم مـن
بە لوتفی خۆت بفەرمـوو پـێم لە سـەر ئەو جادەیـە لادە

ئەوا پیــر و فەقیــر کەوتوومـــە ئەولای بێتفــاقی خــۆ
ئەمــن کــوردێکی بێفێــڵوفەرەج، مەشــهوورم و ســادە

ئەتۆی خاوەنکەرەم، ئەی سفرەڕەنگین! هەر لە تۆ جوانە
کەرەم، بەخشین و چاوپۆشی لە پیـر و کـوێر و ئوفتـادە

ئەوی تۆی نایەتە بیر پڕخەم و دەرد و مەشـەققەت بـوو
کەسێکیش تۆی لە بیر بێ، تا ئەبەد مەسـروور و دڵشـادە

ئەوی تۆی چوو لە بیر، ڕۆژ و شەوی پڕمەینەت و دەردە
کەسێ وا تۆی لە بیرە، خـۆ شـەوی ڕۆژ، ڕۆژی ئەعیـادە

لەبــۆ ڕاوی نەیـــارانی ڕەســـووڵی خۆشەویســـتی تــۆ
"ئیمـــامی" کردیـــە ئەســـتۆ قەڵادە، ســـاز و ئامـــادە

قاقڵاوا، ١٣٦٢ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن



## پیری

پیـــری وا هـــات و ئەجەل لــێم دیـــارە
ڕەنگـــــە ڕامکێشـــــێ بەرەو ئەو خـــــوارە

کوێیــە ئەو خـــوارە؟ دەڵــێن جــێم قەبــرە
گـــــۆڕە، خۆفناکــــــە، گیــــان بێـــــزارە

ئەی خودایـــــە! بەتەنــــێ لەو گــــۆڕە
چــــۆن بمێــــنم، قــــوڕ و بەردم بــــارە!

جـاری ئەووەڵ قـوڕ و گـڵ بـووم و خـودا
گیـــانی پـــێدام و کەچـــی ئەمجـــارە

وردەوردە بـــــە خەیاڵــــــە بەدەنـــــم
تێـــــکبچێ، بێـــــتەوە گـــــڵ دووبـــــارە

بەدەنــــی ناســــکی نەرم و شــــلی مــــن
خــــۆ لەوێ تــــوعمەیی مشــــک و مــــارە

بــــێکەس و بــــێدەر و ماڵتاریـــک خــــۆم
چـــاو دەگێـــڕم هەر ئەتـــۆم لــێ دیـــارە

ئەی لـــە هەرجـــێ هەی و نیشـــە جێگـــات!
کـــاتی ڕەحمـــە بـــە منـــی بـــێچـــارە

---

بحر رمل مسدس مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلن

گەر لەوێ گرپـــە نەکـــا شـــەمعی کەرەم
تەنـــگ و تاریـــک دڵەکەم، خەمبـــارە

تـــۆ "ئیمـــامی" کـــە بـــژی یـــا بمـــری!
ئەرخەیـــان بـــە، بەتەنـــێ خـــوا یـــارە

**قاقلاوا، ١٣٦٠ی هەتاوی**

# چاوەکانم*

تــۆ نەخــۆش بــی ژیــانی مــن ســویرە
چاوەکـــــانم بـــــە لەرزەکەت کـــــویرە

کـــە دەرۆی بـــۆ موعالەجـــە، ئـــاخر
دڵـــی ئیمـــە بـــە شەخســـێ بســـپیرە

چونکـــە کـــۆرپەی دڵـــی هەموومـــان تـــۆی
بـــانەمەڕ چـــوو، چ وەختـــی هـــاویرە؟

دوور لە یەک کەوتـــنەوە گرنگـــە، "عـــومەر"!
تونـــد و تیـــژە، بـــە چەشـــنی تـــاویرە

هەرکەســـــی کەوتـــــە بەر، پەریشـــــانە
دەگـــــرێ وەک تفەنگچـــــی لەو، ســـــیرە

وردوپـــــردی دەکـــــا بـــــە شـــــاڵاویک
بە ســـــەری‌دا دەســـــوورێ وەک گێـــــرە

گیـــــانەکەم! مـــــامەکەت بە قوربانـــــت
خەبەریکـــــــی بنیـــــــرەوە، خیـــــــرە

بۆکان، ١٣٥٣ی هەتاوی

---

* بۆ حاجی سەید عومەری برازای
بحر خفیف مسدس مخبون محذوف: فاعلاتن مفاعلن فعلن

# کاروانی نەمان*

کـــاروانی نیســـتی! تـــۆزێ ســـەبر تەشـــریف بەرە
نێـــو کەژاوەی دڵڕفێنـــت جـــێخەوی نـــازپەروەرە

بۆ هەموو دەرویش و سۆفی، قەوم و خویش، خەڵکی وڵات
مورشـــیدێکی خۆشەویســـتە، ڕێنمـــا وو ڕێـــبەرە

تۆخـــودا ســـەرقافڵەچی! خێـــرا بـــە ڕێگـــادا مەڕۆ
چـــاڵ و چۆڵـــە ڕێـــگەکەت، مانـــدوو دەبـــێ ئەو دڵـــبەرە

چـــوو، منـــیش وا بێوچـــان دێـــم و دەچـــم، بێئیختیـــار
هەر دەڕۆم پێنـــاگەم و بڕوانـــە بوومـــە مەخســـەرە

هەر بـــە تەنیـــا بـــۆ منـــە ڕۆژی قیـــامەت هـــاتووە
ڕۆژ و شـــەو بـــا هەر بقـــووڕێنم لە دووی ئەو ســـەروەرە

کـــاتی ڕۆینـــی پیـــری مـــە "غفرانـــی ایـــزد" نووســـرا
شـــین و واوەیلایـــە، قوڕپێوانـــە، ڕۆژی مەحشـــەرە

قاقڵاوا، ١٣٥٣ی هەتاوی

---

* بۆ کۆچی دوایی کاکی
بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# دانەخۆرە

ئـــافەتی گیـــان و دڵ "کامیـــل"! جەمـــاڵی دڵـــبەرە
قـــاتڵی بـــێ‌ڕەحم و مەســـتم چـــاوی کـــاڵی دڵـــبەرە

کوشتمی، چابوو بە مـاچی لێـوی زینـدووی کـردمەوە
قـــووتی گیـــانم مشـــتنی دوو لێـــوی ئـــاڵی دڵـــبەرە

زولفـی، داوی عاشـقان و کـوڵمی، جـێ‌ڕاوگەی دڵان
دانەخـــۆرەن بولبـــولان لەو جووتـــە خـــاڵی دڵـــبەرە

ســـیپەلاکم ڕەش بـــووە نەمـــدیوە مـــانگی یەکشـــەوە
ڕۆژی جەژنـــم دیتنـــی ئەبـــرۆی هیلالـــی دڵـــبەرە

ئەی "ئیمـــامی" بـــۆ جـــوانی تـــا بڵێـــی بـــێ‌وێنەیە!
عـــاقڵێکی واشـــە، دڵ مـــاتی کەمـــاڵی دڵـــبەرە

قاقلاوا، ١٣٥٠ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# ڕێبەری گەورە

ئەو ڕەهــبەرە کــە گەورەیــی ئێمــە و هەمــوو کەســە
عەلـــلامەی لەدوننـــی بەبـــێ چـــوونی مەدرەســـە

عــالم بــە عــیلم، بێئەمــە کەس دەرســی پــێ بڵــێ
دارایـــی عیلمـــی شـــیمی و فیزیـــک و هەندەســـە

ئەوشۆ عرووجی کرد چووە ســەر، ئەو بــە ســەرووەری
مەحبـــووبی زاتـــی پـــاکی خوداوەنـــدی ئەقدەســـە

حەوت ئاســمان بــە ئــانێ هەمــوو تەی دەکــا بە شــەو
خەڵکـــیش بـــە ڕۆژ و فێـــڵوفەرەج بەرتەری بەســـە

شـــێری ژیـــان لـــە عەرســـەیی مەیـــدانی ئەو نەوی
بـــێتین و هەیبەتـــە بە خـــودا وەک موخەننەســـە

ئەم هەڵبەســـانە چەشـــنی وتەی حـــاجی قـــادرن
هەرچەنــد ئەمانــە شــێعرن و ئەو خــۆ موخەممەســە

شـــیرینزمـــان و ئەفســـەحە ئەو، بۆیــە "کامیــل"یــش
جوانـــە وشـــەی زمـــانی بـــە مەدحـــی مولەببەســـە

بۆکان، ۱۳۳۸ی هەتاوی

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# چ خۆشە

ئەگەر دڵــــبەر دڵئـــارا بـــێ چ خۆشــــە!
بــــەزەوق و ئـــاڵوواڵا بـــێ چ خۆشـــە!

شـــەراب هەرچەنـــدە تـــاڵوتوونـــە، چـــاوم
کــە ســـاقی وا دڵئـــاوا بـــێ چ خۆشـــە!

کەوا مەســـتی لـــە نەشـــئەی چـــاوی مەســـتە
بڵـــێ دەی جـــامی مەی بـــا بـــێ چ خۆشـــە!

لـــە کـــاتی مـــردن و دەرچـــوونی گیـــانم
کـــە یـــادی ویـــم لـــە دڵدا بـــێ چ خۆشـــە!

لـــــە گیـــــــروداری ڕۆژی واپەســــــینم
کـــە ســـینەم لامئەلـــفـلا بـــێ چ خۆشـــە!

ئەگەر فکـــرم لـــە ســـەر "لا" بـــێ چ نـــاخۆش!
کـــە ئیمـــانم بـــە ئەولا بـــێ چ خۆشـــە!

"ئیمـــامی" تـــۆ کـــە لائیلالایـــە زیکـــرت
هومێـــدت هەر بـــە ئەڵـــلا بـــێ چ خۆشـــە!

قاقلاوا، ١٣٥٤ی هەتاوی

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# نان و خوان

دڵـــی مـــن مـــوبتەلای باڵابڵنـــدی نۆجـــوانێکە
لـە دەوری دێ و دەچـێ دایـیم، عەجایـب پاسـەوانێکە

بـرۆی چەشـنی کەوان، برژۆڵـی تیـرە، بسـکی زنجیـرە
ئەسـیری تەپکەیـی بسـک و کـوژەی تیـر و کەوانـێکە

لە ئێش و ئـۆف و نـاڵین و هەناسـەی خـۆی هەراسـانە
هەمیشـە گـوێ بـە ئـاوازی شـنەی کـاتی بەیـانێکە

هەموو گیانم وەکـوو قـامیش هەڵـۆڵ و کونکونـە کـاکە!
ئەگەر ڕاسـتت دەوێ، ئامـادە بـۆ بلـوێری شـوانێکە

کـزەی کـاتی بەیـان هەروەک کـزەی جەرگـی برینـدارە
کەچـی دڵ وا دەزانـێ مەڵحەمـی هەر ئـێش و ژانـێکە

وەریوە مـووی سـەر و ڕیشـم لەبەر پیـری و خەمبـاری
لە بـاغی عەمـری فەوتـاوم، ئەویـش بۆخـۆی خەزانـێکە

"ئیمامی" جەرگی برژاوی، مەزەی فرمێسکی چـاوی بـوو
ئەویش وا خـاوەنی سـفرە و کەبـاب و نـان و خـوانێکە

**قاقڵاوا، ١٣٥٩ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# کاسەی بەتاڵ

سـەرێ شـۆری نەبـێ، کاسـەی بەتـاڵە
دڵـێ عیشـقی نەبـێ، خرچێکـی کـاڵە

نـە ئەو کاسـە دەبـێ پـڕ تـا قیـامەت
نـە ئەو خونچـە دەگـا تـازە، مەحـاڵە

خەزان لەو خونچە دا یـا خـوا بـە بێوەخـت!
سـەگی تـێڕی لـە کاسـەی وا سـواڵە!

سـەرێ بـێ شـۆرە، سەرشـۆڕ و کەسـادە
دڵـی بـێ خۆشەویسـتی بـێ بە کـاڵە

بسـووڕێن پێـی لـە دەشـتێ شـوان و گـاوان!
بـڵا کونکـون ببـێ ئەو تـۆزە خـاڵە!

خەریک بوو دڵ، منیش وەک خـۆی لەگەڵ کـا
وەهـا کـاڵوکـرچ، بەم سـینن و سـاڵە

کەچـی ناگـا گەیشـتم، بوومـە "کامیـل"
لـە نێـو بـۆتەی ئەویـن کەسـبم کەمـاڵە

**تاقڵاوا، ١٣٤٠ی هەتاوی**

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# نیشتمان

تەماشا نیشتمان، ڕێک جێگە مۆڵە
چ وێران و کەلاوە و چۆڵوهۆڵە!

گەلیش هەروا بە فیکرێکە لە کونجێ
کە چۆن بستێنێ لەو بەو فێڵە تۆڵە

بەڵام دەشتودەری زەنویرە هێشتا
لەبۆ سەیرانی گەل زۆر نەرمونۆڵە

هەموو باغ و گوڵ و گوڵزاری هەروا
لەبار و دڵڕفێن و زەردوزۆڵە

لەوێدا من بە جارێ دەستەوئەژنۆم
بە دەست شەختەی زەمانە بووم کزۆڵە

لە نێو ئەو باخەدا بێقەدر و بایی
"ئیمامی" باخەوانێکی کڵۆڵە

**قاقڵاوا، ۱۳۴۶ی هەتاوی**

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# ڕۆژی هەل

سـەد شـوکر کـوردە! ئەوڕۆ ڕۆژی هەلە
هەلە هەڵکەوتـوە، فەرمـوو بە پەلە

وەرە مەیـدان و لە خـوێن سـوورکە وڵات
وا کە لەو خـوێنە تەرم بێـنە مەلە

گەرچـی ئێسـتاکە بە چـاو دەیبینـی
دوژمنـت شـیک و جـوان، قیـت و بەلە

دێ زەمـانێکی لە بەر دەسـت و پەلـت
خـۆ بکـا پـان، بـکەوێ چەشـنی سـەلە

ئەو دەمە تـۆڵە بە دەسـت بێـنە ئەگەر
پیـاوی، بگـرە نەتەوی خـۆت بە پەلە

قاقلاوا، ۱۳۴۲ی هەتاوی

---

بحر رمل مسدس مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلن

# ڕۆژ و تەم

پەرچەم و زولفی لـە سـەر ڕوومەتـی وەک ڕۆژ و تەمە
بـــە هەناســـەم مـــژ و تەم زوو دەڕەوێ، عـــومری کەمە

ڕۆژی ڕووی دەردەکەوێ، بەرگـــــــــی هەژاری ڕووتە
ئـــاهی مـــن زوو دەبـــڕێ دەســـتی درێـــژی زەڵەمە

هەروەکـــوو بـــاخی بەهەشـــت وایـــە ســـەراپا بەدەنـــی
بەژنـــی بەرزی وەکـــوو تووبایـــە، لـــە بـــاخی ئیـــرەمە

بەشی من چـۆن هەیـە لەو سێبەر و بەرگ و بەری ئەو
وەکـــوو بیســـتوومە بـــە تەنیـــا بەشـــی خەڵکـــی حەرەمە

چـــاو لـــە مـــن دادەگـــرێ، وەختـــە ملـــم بشـــکێنم
دێمـــە لای تووڕەیـــە لـــێم، کـــوا ئەوە لوتـــف و کەرەمە!

لـــە منـــاڵیمەوە تـــا ئێســـتە جەفـــام کێشـــاوە
بۆیـــە ســـوڕماوە ســـەرم، کەللەمـــە وەک جـــامی جەمە

دڵـــی ئـــاوارەیی "کامیـــل" بەکوڵـــە ڕۆژ و شـــەوێ
چـــاوەڕێی مـــاچی لـــە لێوانـــە، چ زۆرە و چ کەمە

ئاشی چۆمی زەنبیل، ١٣١٠ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# پیرەغولام

موددێکــە دڵــم لــێ ونــە، ئەو شــێتە نەفــامە
ڕۆیشـــتووە لای قـــامەتی ئەو تـــازە نەمـــامە

بێشــوێن و ئەســەر مــاوە فەقیــرە، بــە ســەری تــۆ
ئەو لێــرە نییــە، کــردەوەکەی ئێســتە لــە لامە

نەســرەوتن و دەرکەوتــن و خــۆ کوشــتن و ســووتان
گریــان و لــە قــوڕ نیشــتن و خــۆ کردنــە عەلامە

جێم گــرتەوە، هەرچەنــدە دەڵــێن خاڵییــە جێگەی
ئەو عاشــقی کوڵمانـــە، ئەمــن مەمکــی شــەمامە

مــن کوشــتەیی شمشــێری بــرۆ و تیــری کەوانــم
ئەو بەنــدی ســەری زولفــی ڕەش و دانە وو دامە

وا دیــارە کــە خــاڵی ڕەشــی دی، بۆیــە فرێــوە
تەیرێکـــی نەزانـــە، چ فریوخـــوردە وو خـــامە

تــازە نییــە دڵ عاشــقی زولــف و خەتوخــاڵی
لەو ڕۆژەوە ناســیویە کــە ڕاســت و چەپــی کــامە

دێـــوانەگیی و عاشـــقی شـــوغڵێکی عەزیـــزن
لایــق بــە هەمــوو کەس نییــە ئەو شــەئن و مەقــامە

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

تەنیا لـە هەمـوو مەملەکەتـی میهـر و مـوحەببەت
مەجنوون بوو کە مەشهووری هەموو خاسە وو عـامە

بەو حاڵـــە پەرێشـــانەوە دووبـــارە "ئیمـــامی"
هـــاتۆتەوە لات، مەنعـــی مەکـــە، پیرەغـــولامە

**قاقڵاوا، ١٣٤٠ی هەتاوی**

# لێبووردن

بێپاس و وەڕ و خوێڕی، وەک سەگ لە قەسابخانە
بێهۆش و سەراسیمە، وەک مەستێ لە مەیخانە

بێمەنزڵ و بێجێگا، شێواو و پەرێشانم
دانیشتوو لە جێگەی چۆڵ، وەک کوندێ لە وێرانە

بێکارە و بێچارە، پەتیارە وو ئاوارەم
هەرتاوە لە لایێکم، بێجێگە و بێلانە

بێزکر و بەبێ تاعەت، بێفکر و خەیاڵم من
دەخولێمەوە ڕۆژ و شەو لەو چۆڵ و بیابانە

بۆ پیری لەکارکەوتوو، لێبووردن و بەخشینە
بۆ "کامیل"ی بێچارە چاوپۆشییە دەرمانە

قاقلاوا، ١٣٦٠ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن اخرب: مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن

# لە خەو هەستان

سـەد بەهـار ئێسـتە بە قوربـانی چـلەی زسـتانە
ڕۆژی ئـازادی هەڵات، کـاتی لە خەو هەسـتانە

نیشتمان بۆتە بەهەشت، سەوزە وڵات و دەرودەشت
گەرچـی زسـتانە، بەڵام چەشـنی بەهارسـتانە

دوژمـنن کەوتـووە، هەسـتانی مەحاڵـە و ئەستەم
هەروەکـوو پیرەگەمـاڵ کەوت و لە بەر دەسـتانە

دەسـتیان بەسـتن ئەوانەی وەکـوو سـەگ یـانیگرن
بـا لـە چاڵیـان بـخەن ئەو تاقمـە چاوبەسـتانە

کەوتـە دووی تەرمـی ڕەزاخـانی کەسـیفی بـابی
لێـیگەڕێن، خـوێنمژە هەر جێگەیـی گۆڕسـتانە

ئەی مەلایـانی بەڕێـز! ئەی گەلـی ئـازا و نەبەز!
بـا لە بیـروو نەچـێ قەت، کـردەوەی ئەو پەسـتانە

قاقلاوا، ١٣٥٧ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

## خەوی من

کەســـێ بێتـــە دەرکـەوبانـــت، تـــۆ بزانـــە بێ‌ئەمـــانە
دەری چۆن دەکەی فەقیرە؟! کـە ئەسـیری دەرکـەوبـانە

بە خەیـاڵی بەژن و بـاڵات بـە شـەو و بە ڕۆژ دەنـاڵم
خەوی مـــن خەیـــاڵی تۆیـــە، دزە، دێتـــە لام شـــەوانە

تۆ کە خۆت لە ترسی خەڵکی لە منی فەقیر تەوەلـلای
لـە نەیـاری سـەگ مەترسـە، وەرە لام بـە مەحرەمـانە

خۆ لە ماڵی دڵ بـە تەنیـا، هەر ئەتـۆ و خەیـاڵی تـۆیە
کەسی دی نییە لەبەر تـۆ، لەوێ قـاتی ئیـنس و جـانە

بە دەمی بە پێکەنین و بـە دوو چـاوی پـڕ لـە غەمـزە
ئەمـنم کە مـوبتەلای تـۆم، بە سـەرت قەسـەم، بـزانە

سەری من لە ڕێی سەری تۆ کە نەچێ بەکاری چی‌دێ
بە بڕین چێ چاکە "کامیل"، کە لە سەر لەشـت گـرانە

**گەردیگلان، ١٣٢٩ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن مشکول: فعلات فاعلاتن فعلات فاعلاتن

# مەفەرموو من نەماوم*

لــە خەڵوەتخـــانەیی عیــززەت، بــراکەم! جێــت نومایــانە
بەڵام بـــۆ هەر وەفـــادارێکی تـــۆ هەر شـــین و گریـــانە

سەرم ســورِما، دڵـت چـۆن هـات بەجێمبێڵـی بـە تەنیـایی؟
بـە تەنیـا هەر بـرات مـن بـووم، لە تـاوت بوومـە دێـوانە

دەرِۆم ئەم ماڵ و ئەو ماڵ، دێ بە دێ، ئەم شار و ئەو شارە
دەســـوورِێم لەو بیابانانـــە، دەشـــت و کێـــو و شـــاخانە

دەڵێم کوا کاکی من، کـوا بـابی مـن، کـوا نـووری ئیمـانم؟
بڵـــێم دوای تـــۆ بـــراکەت کـــاری قورپێوانـــە، ســـووتانە

ســـڵاوت لـــێدەکەم جـــوابم دەوە، هەر وەختـــە پەڕ دەرکەم
تکاشـــت لـــێدەکەم: تـــۆزێ نەوازش، دڵ هەراســـانە

"محەممەد"! تـۆش بە فریـادم بگـە ئەی شـافیعی مەحشـەر
ئەتۆ بـێو گەورەییـت، نەختـێ سـەبووری، رۆژی ئیحسـانە

بـرام! تـۆش تـۆ خـودا چـاوێ هەڵێنـە بـۆ بـرات، خێـرە
مەفەرمـوو مـن نەمـاوم، تـۆ "وەلـی" خـۆ هەر لـە بیرمانـە!

خودا فەرمووی لـە قورئانـا "وەلـی" قەت نـامرن، زینـدوون
ئەوان رِزقیـــان لە لایەن خـــالیقی بێچـــوون و ســـوبحانە

**قاقڵاوا، ۱۳۵۳ی هەتاوی**

---

* بۆ وەفاتی کاکی

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# ڕۆژی زەفەر*

وەرن توخـوا، کـە چـاوم وا لـە مەڵبەنـد و گوزەرتـانە!
وەرن، ڕۆحـم وەکـوو پەروانـە دایـیم دەوری سـەرتانە

چران، ئەمما وەکوو خۆر دەوری خۆتان کردووە ڕووناک
شـەمن، ئەممـا لەبـاتی ئێـوە دیـدەم چـاوی تەڕتـانە

مەترسـن گیـانەکەم کـاتی خەتەر تەئمینـوو حاسـڵ بـێ!
کـە مـن گیـانم لـە پێناودایـە، قەڵغـان و سـوپەرتانە

بـەلا تیـری بەڵا هەر بـۆ منـی بێچـارە بـێ چـاکە
کـە سـۆز و ناڵەنـاڵم هەمڕەهـی ڕۆژی سـەفەرتانە

وەرن "تورجـانی" و "زەنبیلـی" و "جەمیـانی" خێـرایەک!
موفەڕڕەح کەن دڵـم، هەر چـاوەڕێی بـاس و خەبەرتـانە

مەڵـێن بـاریوە سـەرمایە، ئەویـش نەیمـاوە سـەرمایە
هەمە؛ گەر ئێوە غەوواسـن، ئەشـک بەحـری گوهەرتـانە

لە زەنبیل تاکوو ئێرە نیـو سـەعات نـابێ بـە مەعلـوومی
دەسـا تەی‌کەن بە غـار ئەو ڕێ نـزیکەی وا لە بەرتـانە

وەرن گیانـە! وەدەرخەن گەوهەرێ لەم بەحـرە تـا مـاوم
نەوەک بمـرم، دەس‌وبـرد کەن کەسـم! ڕۆژی زەفەرتـانە

**قاقلاوا، زستانی ١٣٣٥ی هەتاوی**

---

* بانگی ئامۆزا و برازاکانی دەکا

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# پاشای بەهار

ئەوا کـــــاتی خەبـــــاتی بولبـــــولانە
دەمـــی پشـــکووتنی خـــونچەی گـــوڵانە

نـــە تەنیـــا جۆگـــە وو جۆبـــارە زەنـــوێر
گـــوڵ و لالـــە لـــە ئاســـۆگ و تەلانە

نـــە تەنیـــا هەر مـــرۆ بەشـــدارە ئەمـــرۆ
دەرودەشـــت مەســـتی بـــۆنی ســـونبولانە

هەموو جێ خـــوار و ژووری زەرد و ســـوورە
کەســـێ بێـــت و ســـەرنج دا عـــاقڵانە

دەزانـــێ بەخششـــی پاشـــای بەهـــارە
بەڵـــێ وایـــە عەتـــایی عـــادڵانە

هەچـــی زیـــرووحە شـــایی کەوتـــە نێـــو دڵ
زەمـــانی خۆشـــیی و چەپڵـــە و پـــلانە

لە ســـەر جۆگانـــە هەڵپەڕکێـــی کوڕوکـــاڵ
کـــە بەزمـــی بولبـــولانیش ســـەر چـــڵانە

هەمـــوو دنیـــا سەراســـەر وەک بەهەشـــتە
نەمـــاوە ڕۆژی مـــاتەی نـــاو کـــولانە

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

کــونەڕەش بــۆ کەســێکە بــێ گــوڵ و دڵ
ئەوا کــــاتی گــــوڵان، جێژنــــی دڵانە

"ئیمــامی" بانــگ دەکــا: ئەو جێژنــە پیــرۆزا!
لــــە کــــورد و کیژوکــــاڵی ژیــــکەڵانە

ئاشی زەنبیل، ١٣١٥ی هەتاوی

# مەحشەر

خاڵی نوستوو! هەستە، بەستە؛ ئێستە ڕۆژی مردنە
کاتی لێک جیابوونەوەی چاکە و خراپە کردنە

گوێت لە دەنگی نەفخی سوورە، لێ‌دەدا، ئاگات دەکا
پێت دەڵێ حەشرە، لە ترسان شێری نەڕ هەروەک ژنە

چاوەڕێ بن، وا تەرازووی خێر و شەڕ هاتۆتە گۆڕ
سەگ بە حاڵی ئەو کەسەی خێری بە قەد خێری مەنە!

باڵی ئاڵای کێیە ئەودەم سەدهەزار چاک و خراپ
دەچنە ژێر سایەی، لەوێ‌دا چاوەڕێی لێبووردنە

ئەحمەدی موختارە، شیرین سوارە، ئەو سەردارەیە
ڕووی لە هەرکەس بوو، لەوێ‌دا کاروباری ڕۆشنە

ئەی "شفیع‌المذنبین"! دەستی من و داوێنی تۆ
دێمە ژێر ئاڵات و ڕێم‌کە، گەرچی ئیحسانم ونە

وەک دەڵێن ئەمنیش لە نەسلی پاکی تۆم، ئەمما ئەمن
ڕووڕەش و خاوەن گوناهم، کارم ئارەق‌ڕشتنە

ئاگری دۆزەخ نەبێ، ناتوێتەوە ئەو مارزە
لێی گەڕێ بتوێتەوە، با ساف بێ هەروەک ئاینە

**زەنبیل، ۱۳۱۶ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# نۆرە هەنگاوی منە

تـــک‌تکەی بـــارانی پـــاییز وەک تـــکەی چـــاوی مـــنە
کاتی هەڵقرچـاوی بـاغ وەک جەرگـی بـرژاوی مـنە

هەر خڕ و شیویێ تەماشا کەی، خڕی پڕ بوو لـە ئـاو
هەڵدەچۆڕیێ لێڵ و لـیخن، چەشـنی زووخـاوی مـنە

هەورە، بایـــە، بەفـــرە، بارانـــە، تەمـــە، ســـەر کێوەکـــان
هەردەمەی جۆرێکـــە، هەروەک حـــاڵی شـــێواوی مـــنە

ئەمـــن و بەفـــری ســـەر چیاکـــان پـــێکەوە دەتـــوێینەوە
کاکـــە! ئەم زســـتانە بەفـــریش عـــومری فەوتـــاوی مـــنە

ئەی خـــودا! بۆچیمـــە تـــازە ژینـــی هێنـــدە تـــاڵوتـــوون
دوو بـــرا بـــووین، بـــازی‌دا ئەو، نـــۆرە هەنگـــاوی مـــنە

**قاقلاوا، پاییزی ۱۳۵۳ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# زستان

یــاخودا زســتان بەخێــرێ، چــونکە وەک یــاری مــنە
ســارد و ســڕ، بێمیهــر و بــێمەیلە، جەفاکــاری مــنە

ڕووی لە ســەر کوێســتانەکان تــاڵە، بە ڕق هــاتۆتەوە
هەروەکــوو یــار دێــتەوە مــاڵێ بە ئــازاری مــنە

بەرگوبــاری دار و گــوڵزاری بە شــەختە کــرد نەخــۆش
هەروەکــوو جەرگ و دڵ و گیــانی بریــنداری مــنە

تــکتکەی گوێســوانەکانی وەک زووخــاوی مــن دەچــێ
ڕەنگــی ســیخواری وەکــوو ڕیشــی ســپیکاری مــنە

بــۆ ســپیکاری عەجەب وەســتایە زســتان، چــاوەکەم!
وەک خەمی مــن مــووی ســپی کــردووم و میعمــاری مــنە

چەرخی گەردوون بۆ لە سەر من، بەختی من، نادا خولێک
هەر لە ســەر یەک لاتەنیشــتە هەروەهــا بــاری مــنە

پێچەوانەی خۆی کە جاران چەرخوخول بــوو کــاری ئەو
هەر دەڵــێ شــان و ملــی "کامیــل" وەفــاداری مــنە

**قاقڵاوا، ۱۳۵۶ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# تیر و کەوان

ئەو نێرگسـی پڕفیتنـه و شـۆره چ بەقینە!
چەنـد مەسـت و چ خوممـار و چ عەییـار و بەتینە!

ئەبـرۆی کـه لە سـەر چاویـە، بـڕوا بکـه چـاوم!
ئەو هەر لـه کەوانکێشـیی و ئەم هەر لـه کەمینە

ئەی مـن به فیـدای خـاوەنی ئەو تیـر و کەوانە!
هەرچەنـد کـه دڵـم کـاری هەمـوو زام و بـرینە

ئەی دڵ! مەبـه دەربەنـدی غەمـی نـاوکی غەمـزەی
سـاڕێژە بـرین، مەوقیعـی ئـازادیی و ژینـه

یـانی کـه لە ژێـر سـایەیی زولفـی شـەوەزەنگی
ڕۆژ دەردەکەوێ، کـاری خـودای گەورە ببینـه

لەم کەشمەکەشـی تیـر و کەوان، چـاو و بـرۆیە
دیـم ڕەحمەتـی حەق نازڵـه، زانـیم بـه قەرینـه

"کامیـل" وەکـوو تەیرێکـی بەهـار دێتەوە کوێستان
هـاتۆتەوە ئەم کێـو و کەژ و مەزرەعـه شـینه

ئاشی زەنبیل، ١٣١٥ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

# شووشەی دڵ*

کە هـــێمن ڕۆیـــی، شووشـــەی دڵ شـــکاوە
نەمـــــاوە تــــــاقەتم، هێـــــزم بــــــڕاوە

ئەوینســـــتەش هەر لە بەر چـــاوانە وێـــنەت
مەڵـــــێ ئــــابڕوو لە چـــاودایە، تکـــاوە

تکـــــابیتیش، لە بەر پێــــــتە گلێـــــــنەم
وڕێـــــــنەت بۆدەکــــــا چــــاوم لە لاوە

نە تەنیـــا شووشـــەکەی دڵ کەوت و چـــڕژا
نەمـــــامی بــــاغی ژینیشــــم چەمـــاوە

بە مەرگـــی تــۆ پیـــاڵەی عەیـــش و نۆشـــم
لە ســـــەد جـــێ درزی داوە، لـــێم ڕژاوە

لە ســـارا وو کەژ و کـــۆ شـــوێنی تـــۆیە
بەڵام دەرکـــــی هەمـــــوو کەس داخـــــراوە

لە هـــیچ لایەک ســـەدا نـــایێتە گـــوێی مـــن
دەڵێـــی حەشـــرە و کەســـێ ئیتـــر نەمـــاوە

---

* بۆ وەفاتی مامۆستا هێمن

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

له کوێســـتانیش نەمـــاوە چیـــغ و چـــادر
دەڵێـــی خـــاوەن پەزیـــش تـــاوڵی دڕاوە

بە گریـــانی ســـەماش کوێســـتان خزیـــوە
لە هەر لایێکـــــی ســـــێلاو تێیخـــــزاوە

لە کـــورد و کـــوردەواری و نیشـــتمانم
چ هیـــــوا وو هومێـــــدێکم نەمـــــاوە

بە هـــۆنراوە خەیـــاڵی تەونـــی خـــۆم کـــرد
کەچـــی ڕیســـم لە ســـەد جێـــوە پســـاوە

تەشـــی نەخـــولاوە بەختـــی مـــن بە لاوی
کە کـــرژی بـــا بـــدا، جـــا بـــۆیە خـــاوە

بە مەرگی تـۆ بـوو «ئـاوات» بـۆتە پووشـێک
لە گۆمیشـــی بـــخەی، تەرمـــی ســـەرئاوە

مهاباد، ١٣٦٥ی هەتاوی

# دەردی دڵ

پشتم بە بـاری مینەتـی خەڵکـی جـدەو بـووە
دەستی قەزاش لە من دەری ئومێدی بەسـتووە

تا کەی بڕۆمـە ئێـر و ئەوێ، ئەسـرەوم دەمـێ؟
تا کەی ئەجەل بە سەبر و مودارایـە، نوسـتووە؟

یـــاخوا ملـــی شـــکێ، وەخەبەر نایـــە مـــارژە!
داخوا بە داخ و دەردەوە کێی دیشـــی خســـتووە؟

چەرخـــی فەلەک کـــە پیرەژنێکـــە هەزار ســـاڵ
ڕیســـی هەزار "کامیـــل" و فەرهـــادی ڕســـتووە

قاقڵاوا، ۱۳۴۰ی هەتاوی

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# تۆبە

واعیــزێ دەیگــوت کەســێ زانــا بــێ، تــۆبەی کــردووە
دڵ بــە وەعــزی وا کەچــی، تــۆبەی لــە تــۆبەی کــردووە

ئەو دەڵــێ دوور بــە لــە یــاری شــۆخ و شــەنگ و نــازەنین
دوور لە یار شێتە کەســێ وەعــزی لــە گــوێچکەی گرتــووە

هەرکەســێ بــۆی دەس بــدا ســاتێ لــە ئــامێزی گــرێ
تــا لــە دونیــادا دەژی، دڵخۆشــە، ئــۆخەی کــردووە

مــن شــەوێکی گرتمــە ئــامێز، کەچــی زەیــنم کە دا
وا ڕەقیبــی بەدمەزەب لەولاوە کوشــمەی کــردووە

تێکــیدا عەیشــم، شــکاندی هەم دڵــم، هەم پیــاڵەکەم
مــاوەیەک بــوو مــاڕزە لــێم ڕوون بــوو، سۆســەی کــردووە

واعیــز و ســۆفی و ڕەقیــب هەرســێ لەگەڵ مــن دوژمــنن
خاســە مامســۆفی لە کــاری ئێمــە ڕەخــنەی کــردووە

دڵ وەکــوو تەیــرە کــە دیتــە دەرکــی یــار، ســۆفی دەڵــێ
بیکــوژن، وەیشــووم لە ســەر وێرانــە لانەی کــردووە

کونــدەبوو بۆخــۆیەتی بەو ڕیشــەوە، بەو تیشــەوە
ڕیشــەکەی تیشــەی، هەزار دەســت و پەلــی پەی کــردووە

---

بحررمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

هەرکەسێکی گەر ئەویندار و برینـدار بـێ دەڵـێ:
ســۆفیانی ڕیش‌درێـژ، خوێنیـان لـە کاسـەی کـردووە

بـۆ "ئیمـامی" واعیـز و سـۆفی و ڕەقیـب فەرقـی نیـیە
دڵ بە دەست ئەو سیانەوە گوێـت لێیـە، وەی‌وەی کـردووە

**قاقڵاوا، ١٣٤٥ی هەتاوی**

# گوارە

چییــە گــوارە بــە گــوێ هەڵتاوەســیوە؟*
ســـــەرەوژێر و مـــــوعەللەق لەو نەدیـــــوە

زەعیــف و بــێکەس و بێ‌یــار و هــاودەم
بــەبێ دەنــگ و ســەدا هەروەک هەتیــوە

بــە گــوێ گیــراوە وا زەرد هەڵــگەڕاوە؟
وەیــا لەو دەرکوبانــە گوێــت بڕیــوە؟

لــە ترســی مــاری زولفــت هەڵــدەلەرزێ
لەبۆیــــــە زەرد و زار و ڕاچەنیــــــوە

عەجایــب گیــری کــرد لەو جێگــە ســەختە
بەجێ‌مــــاوە بــــە تەنیــــا لەو پەســــیوە

بــە گــوێ هەڵتاوەســیوە ئەو نەفــامە
کەچــی پێــی وایــە تــۆ بــۆ گوێــت کڕیــوە!

گەردیگلان، ١٣١٨ی هەتاوی

---

* نالی دەڵێ: سەراپا زەردیی گوارە ترس و لەرزە   دەڵێی عاسی بووە لەو جێگە بەرزە
بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# بەهاری تازە

ئەوا چەمەن بە عیشقی گوڵ، دەری شـەعەف دەکـاتەوە
بە فەرشـــی بەرگـــی نەســـتەرەن، بیســـاتی ڕادەخـــاتەوە

لە هەر چڵێـک و هەر گـوڵێ، نەوایـی بولبـولی حەزیـن
لە هەر کونێـــک و قـــوژبنێ، ســـەدایی دڵ دەداتەوە

چنـــار و ســـەرو و نـــارەوەن، بە دەم نەســـیمی بەربەیـــان
وەلەرزە کەوتـــن و دەچـــن، بە پیـــر دەمـــی حەیـــاتەوە

دەمی نەسیمە وا کە دێ، نەسـیمی موشـکبۆیی گـوڵ؟
وەیـــا شـــەمیمی دڵســـتان، بە مـــوژدەیی نەجـــاتەوە؟!

ســـریلە هـــاتوچۆیەتی، بە ســـرتە گفـــتوگۆیەتی
بە ســـروە پـــێم دەڵـــێ ئەوا بەهـــاری تـــازە هـــاتەوە

عەجەب بەهـــاری دلگوشـــا، قەدەم بە خێـــر و جـــانفەزا
چ خۆشـــە بـــایە وادەکەی، کە دێـــتە نێـــو وڵاتەوە

ژیـــاوە دل بە ســـروەکەی، گوڵاتەشـــین گەشـــایەوە
هەرەس کشـــاوە ســـەر چیـــا، فەقیـــرە زۆر بە مـــاتەوە

بڵـــێ قشـــوونی گـــول بەدڵ وەدەرخە تـــاکوو فرســـەتە
بە تەپـــڵ و تـــۆپەوە وەرە، بە لەشـــکر و ســـوپاتەوە

---

بحر هزج مثمن مقبوض: مفاعلن مفاعلن مفاعلن مفاعلن

ئەمـــن لە تـــاليعی ڕەشـــم، جەمـــاڵی ڕووتە ئـــارەزووم
خزابـــووە هەوری نەگبەتـــی، ئەویـــش ئەوا هەڵاتەوە

لەبەر کـــزەی مـــرم ســـەبا، کە خـــونچە هـــاتە پێکەنـــین
خەمـــی هەزار ســـاڵە ئەو، لە بیـــر بەشـــەر دەبـــاتەوە

"ئیمـــامی" وەک ســـریلەکان لەگەڵ دڵـــی قســـان دەکـــا
ئەویـــش بە ســـرتە پـــێم دەڵـــێ: بەهـــاری تـــازە هـــاتەوە

کانیبەن، ١٣٣٠ی هەتاوی

# دزیومەتەوە*

یار دڵی بردبووم شەوێک بەدزی
من بە ڕۆژێکی ڕوون دزیومەتەوە

تا قڕ و فڕ نەکا بە فیز و بڵێ
کۆرپەکەی من لە شیر بڕیومەتەوە

من قەریحەم فرۆشتبوو هەرزان
بە گرانتر بەڵام کڕیومەتەوە

چونکی قافیەم نەما، بە پاڵەپەسۆ
هاتم و گورجێ تێخزیومەتەوە

لە هەزار کەند و کۆسپ و بەرز و نەوی
لە سەدان چۆم و ئاو پەڕیومەتەوە

دێمە مەیدانی هونەرانی بەڕێز
پاییزە، وەک گەڵا وەریومەتەوە

گەرد و تۆزی گوڵم لە گوڵشەندا
بە پەڕوپۆی دڵم سڕیومەتەوە

---

* مامۆستا حەقیقی و ئاغا سەید قادری سەیادەت (سەید) و حاجی سەید جەمیلی هاشمی لە سەر ئەو قافیە و ڕەدیفە هەرسێکیان شیعر و نامەیان گۆڕیبووە. ئیمامیش بۆوەی بێبەش نەبێ، ئەم شیعرە دەڵێ.

بحر خفیف مسدس مخبون محذوف: فعلاتن مفاعلن فعلن

## غەزەل/ ٢١٧

که نەخـــۆش بـــووم، بڕابـــوو کفنەکەشـــم
ئەوچەلـــیش خـــۆ شـــوکور دڕیـــومەتەوە

ئەوە "ئـــاوات" بـــوو ون ببـــوو لێمـــان
لە کەژ و کـــۆی ئەویـــن بـــوو، دیـــومەتەوە

قاقڵاوا، ١٣٥٥ی هەتاوی

# داخی تۆ سەختە*

داخــی تــۆ ســەختە لە ســەر دڵ، چــڵ دەدا و دەکــولێتەوە
مــــامی پیریشـــــت لە تـــاوت گیانـــــە هەر دەخـــــولێتەوە

مـــــانگی ڕێبەنـــدانە بـــۆیە بەنــــدی جەرگ و دڵ پســـــا
هەرکە بیـــــری تــــۆ دەکەم، دەکــــــولێتەوە و دەپســـــێتەوە

عالەمت سووتاند بە مەرگی خۆت و ئەمنیش جەرگ و دڵ
هەروەکــــوو شــــەم هەڵبــــووە، دەگرێــــت و نــــاکووژێتەوە

ئەو هەمــــوو ئەخـــــلاقە شـــیرینەت لەگەڵ پیــــر و جەوان
دەک کـــــوت‌وپڕ بـــــم، ئەگەرســــاتێ لە بیـــــرم چێـــــتەوە

بەفــــر و ســـــەرمایە و دڵـــیش ڕێــــگەی بە جـــارێ بەســـــترا
بەفــری خەم کەنگــێ لە ســـەر بســـتووی دڵان دەتـــوێتەوە؟

تەم وڵاتـــی گـــرت و خەم دایگــــرت هەمــــوو خاوەن‌دڵێــــک
ئەو گرێپـــووچکەی لە ســــەر دڵ، داخــــۆ کەی دەکـــرێتەوە؟

داخــۆ تـــازە گـــوڵ لە باخـــان شــین دەبــێ بــێ شــاعەلی؟
داخـــۆ کـــۆرپەی جـــوانی هیـــوای گەل ئەرێ دەشـــنێتەوە؟

---

* بۆ کۆچی‌دوایی برازای خۆشەویستی، خوالیخۆشبوو «عەلی‌شا»
بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

تـــــازە نـــــابینم ئەوانە تـــــاوەکوو ڕۆژی حەشـــــر
ڕۆیـــــین و نابینـــــدرێن، تـــــازە زەمـــــان نـــــاییتەوە

سـالّی پەنجـا و نـۆ بـوو، ڕێبەنـدان بـوو، بەنـدی دڵ پسـا
وا پســـا جەرگ و دڵـــی "کامیـــل" کە یەک نـــاگریتەوە

**١٣٥٩/١١/٣ی هەتاوی**

# شەمعی کامیل*

چۆن دڵت هات تـۆ بەجێـتهێشـتم، بـە تەنیـا مـامەوە؟
نەتـدەزانی دوای نەمانـت شـێت دەبـووم دەخـولامەوە؟

بێخەبەر بووی تۆ مەگەر، پاش تـۆ ئەمـن حـاڵم چیـیە؟
نەتـــدەزانی هەر لە بەردەرکـــت لە قـــورِ دەتـــلامەوە؟

نەتدەزانی تینـی لێجوێبـوونەوەت دەمکـا بـە چێشـت؟
هەر بە چەشنی شەم لە جێی خۆم دەسبەجێ دەتوامەوە؟

قورِبەسـەر خـۆم کاکـە، بێتـۆ دەربەدەر، مـات و هەژار
هەرچی خۆشـیم دی، بـە مەرگـی تـۆ بـە سـاتێ دامەوە

زامـی دڵ دیـوەودەرە، قوربـان! بـە مەرگـی تـۆ قەسـەم
رِەنگـە زوو بمـرم منـیش دوای چـاوی تـۆ بەو زامەوە

وا پرِیشکی ئـاوری دووریـت کەسـم! وایکـرد لـە مـن
شۆرِشـــی ئەو ئـــاورە هاتۆتـــە نێـــو ئەعـــزامەوە

شەمعی "کامیل" بووم بە هۆنراوەی جـوان لای هـۆنەران
ئێسـتە کاکەگیـان! لـە تـۆ دوور کەوتـم و کـووژامەوە

**قاقڵاوا، ١٣٥٣ی هەتاوی**

---

* بۆ وەفاتی کاکی

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن.

# نابووژێمەوە*

تــــۆ بـــە زەخمـــی مەعـــدەوە دەتلێـــیەوە
مـــن بـــــە دەردی مەرگەوە دەخـــــولێمەوە

جەرگ و دڵ بـــۆ تـــۆ برینـــداره "عـــومەر"!
هەر ببیســـــــم عـــــاجزی، دەکـــــولێمەوە

یـــاخودا دەردت لـــــە ڕۆحـــی مـــن کەوێ
گەر قەزای تـــۆم لــــێ‌کەوێ دەژیـــێمەوە

تــــۆ بمێنــــی، نۆجــــوانی، چــــاترە
مــن کـــە پیـــرم بـــا بـــڕۆم، ببـــڕێمەوە

مـــامەکەت چەنـــد ڕۆژە بـــۆت بۆتـــە کەبـــاب
لـــــێم‌گەڕێ یەک‌جـــاری هەڵقـــــرچێمەوە

زۆر بەهـــــارێکی سرِوســـــاردە لـــــە مـــــن
وشـــک هەڵاتـــووم، تـــازە نـــابووژێمەوە

جـــا مەگەر تـــۆ بێـــیەوە بۆکـــانێ زوو
بـــا منـــیش بـــۆ لات بە خۆشـــی بـــێمەوە

**قاقڵاوا، ١٣٤٥ی هەتاوی**

---

* بۆ نەخۆشیی سەید عومەری برازای
بحر رمل مسدس محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# بەختی خەواڵوو

ئەو بەختی خەواڵووی من، تاکەی وەخەبەر نایە؟
من پیـر و لەگورِکەوتـوو، ئەو کـۆرپە وو سـاوایە

ئەو قەت وەخەبەر نایــە، مــن نایــە بەلامــا خەو
ئاگــان لــە مــن ئەوشــۆکە، ئەســتێرە وو هاوســایە

مــن وا لــە وتــان کەوتــم، ئەو هەر لــە گورِوگــاڵە
جارجــار لــە خەوا دەیکــا، بــۆ خــاتری لای‌لایە

لای‌لایەیــی ئەو کۆرپــە، نــاڵەی دڵمــە بــۆ وی
شــێتە وەکــوو مەجنوونــە، بــێ‌جێگە وو مەئــوایە

لەیلایــە مەرامــی وی، نــابیبینێ هەتــا مــاوە
تا جانەوەران خۆش بن، هەر مەیلی بـە سـەحرایە

ئەم خــانووە پــڕ مەینــەت، ئەم قــۆنجرە ڕووخــاوە
چوارچێــوەیی ناقــاییم، نێــوی چییــە؟ دونیــایە!

ژێــر ئەو کەســەیە دەســتی، هەڵگرتبــێ لەم دونیــا
کاســــێکی بەتاڵــــە ئەو، هەمبــــانەیی پڕبــــایە

وەک هۆنەری زوو فەرمووی: سەرپاکی گلاون ئەم
ئەولا بگــرە "کامیــل"، دەســت هەڵگــرە لەم لایە!

گەردیگلان، ١٣١٧ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن اخرب: مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن

## شاباشی بەهار

وەی‌وەی چ بەهارێکـــــە! وەک جەننەتـــــی مەئـــــوایە
وەک بولبـــــولی دڵ عاشـــــق، ئـــــاوبردەیی ســـــارایە

نیلـــووپەڕی نێـــو ئـــاوان، هەرچەنـــدە کـــەوا ســـاوان
وەک چی دەچێ ئەو چین‌چین؟ وەک زولفـی چەلیپـایە

شاباشـی بەهـاری کـرد، گـوڵ ڕشـتی لـە خـۆ شـەونم
پێشـــــوازی دەکـــــا بولبـــــول، داخـــــوازی دڵـــــی لایە

زەرد و سـپیی و شـینە، چـیمەن بـە هەزار ڕەنـگە
ڕازاوەتەوە وەک بـــــووک، بەو ئەتـــــڵەس و خـــــارایە

کێو و دەرودەشـت سـەوزە، خونچـە هەمـوو پشـکووتن
لەم فەسـڵە گـوڵی نێـرگس، وەک چـاوی تەماشـایە

سوێسـن بـوو زمـانی گـرت، لەو خۆشـییە وەک شـاعیر
دەیگـوت گوڵـە، گـوڵ بووکـە، هەر بولبولـە زاوایە

لەم کاتـە نەمـا کەس کـز، هەر سـۆفی و دەروێشـن
بێ‌مایـە و دڵڕێشـن، بـێ‌بەش لـە هەمـوو کـایە

سـەر هێلکـە و هێلانـە، کورکـوڕ کـڕ و کەو کەوتـن
تەنیـــا دڵـــی مـــاڵوێران سەوداســـەر و شـــەیدایە

داخـــوازی دڵ و بولبـــول هاتۆتـــەدی لەم کـــاتە
"کامیـــل" کـــە بـــە تەنیـــایە "ئـــاوات"ی بـــەجێ‌نایە

**قاقلاوا، ۱۳۴۵ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن اخرب: مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن

# هەر درۆیە

سەراپا هەرچی فەرمووت هەر درۆیە
هەموو فەرمایشت بێ تار و پۆیە

وەڕەز بووم من لە خوڵفی وەعدەکانت
نەفەرمووی عاشقی من هەرزەگۆیە!

ئەتۆ فەرمووت شەوێ دێمە کەنارت
وەرە، ئەسپابی شادی گردوکۆیە

سەماوەر سینە، چا خوێنی جگەرمە
کەلامم نەقلی نوقڵی لەعلی تۆیە

ئەگەر ئەمجارەکەش وادەت درۆ بێ
بەجارێکی "ئیمامی" ڕەنجەڕۆیە

گەردیگلان، ۱۳۱۹ی هەتاوی

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# شایی*

یــاخودا کاکــە! موبــارەک بــێ لــە تــۆ ئەم شــایی‌یە
ئەم ســـروور و خۆشـــییە، لەو خانەقـــا و ئـــاوایی‌یە

غەم نەما، حەسرەت بە جارێکی کەوت، ئەستۆی شــکا
ئـــاه و نـــاڵەی دڵ دەگەڵ ئەم داوەتـــە خـــۆڕایی‌یە

ســفرەکەت ڕازاوە، هەروەک ســفرەیی حــاتەم دەچــێ
فەخــرە بــۆ دۆســتت، بەڵام بــۆ دوژمنــت ڕیســوایی‌یە

گــورگی کێــوانیش هەموویــان تێــر کــران لەم داوەتە
کاکـــە ئەنـــوەر بەزمەکەی، وا دیـــارە ملـــوێن‌بـــایی‌یە

کــوا گەڵاڕێزانـــی پـــاییز بـــوو لـــە حەوشـــی خانەقـــا
کـــاتی شاباشـــی گوڵانـــە، چـــاوەکەم لەم دوایـــی‌یە

خانەقا پڕ بوو لــە ئەنــواعی بەشــەر، کــاک ئەنــوەریش
هەر خەریکــی فیکــری بیکــر و خەڵــوەتی تەنیــایی‌یە

زاهیـــرەن ئازایـــە، وەک شـــێری ژیانـــە خـــۆ، بەڵام
داخەکەم ـ وەک مــن بــزانم ـ بــاتینەن مووســایی‌یە

جووی جەنــابی "حــاجی"یــە هیچــی لــە بــاراندا نیــیە
گەر لـــە پەردەش بێـــتەدەر پیاوانـــە، ئیستیســـنایی‌یە

**زەنبیل، پاییزی ١٣٣٩ی هەتاوی**

---

* بۆ شایی حاجی سەید ئەنوەری برازای

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# بەهاری ناخۆش

وا بەهـــار هـــات و بەڵام بولبـــولی دڵ بێنەشـــەیە
خونچـــە پێنـــاکەنێ، کـــۆرپەی نەتەوە بێگەشـــەیە

کۆتر و قومری، قەل و داڵ، ڕێکی بە جەم چوونەوە ژوور
ســـارد و ســـەرمایە وڵات، چۆڵـــە جیهـــان، بێخشـــەیە

کەوی کێـوی وەڕەزن، چونکـە نەبـوو شـین کەژ و کـۆ
پێـــی نەمـــاوە گـــوڕە، بێکەیفـــە، لـــە پاشەکشـــەیە

پیرەگـــامێش لە لەوەڕ کەوتـــووە، هەڵـــدیتەوە ژوور
مـــوبتەلای دەردی گـــران و ســـەدەمەی خشخشـــەیە

هەرکەســـێ خۆشـــە دڵـــی، کـــاکی "ئیمـــامی"! بە خـــودا
پـــاکی فێڵـــە و تەڵەکـــە، ڕێکـــی درۆیـــە و فشـــەیە

قاقڵاوا، ١٣٤٧ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# بۆ شەهیدانی بانە

نیشـــتمان ئەمڕۆکــە ڕەش‌پۆشـــی شـــەهیدی بـــانەیە
داغـــداری کـــــردەوەی ئەو دەســــتە خـــــوێنڕێژانەیە

بـــۆ شـــەهیدی شـــاری بانــە پیــر و لاو گریـــانیە
نیشـــتمان ئەمســــاڵەکە بـــۆ لاوەکـــان گۆڕخـــانەیە

کوردەکان! ئەی گوردەکـان! ئەی لاوی پڕهێـز و قەوەت!
ڕۆژی تـۆڵەی خـوێنی ئەو جووتـە شـەهیدە جـوانەیە

نیشـــتمان بـــانگوو دەکـا: ئەی ڕۆڵەکەی کـاوەی نەبەز!
وەرنــە مەیــدان، کـــاتی پــڕدان و شــەڕی پیـــاوانەیە

هەرکەســێ بــۆ ســەندنی تۆڵــە لــە مەیــدان حـــازرە
نێـــوی ئەو هەر قارەمانـــە و مەردی ئەو مەیـــدانەیە

بـــا بـــڕۆین، پێی‌نـــاوێ ئیتـــر بیـــری داهـــاتوو بکەیـــن
تانـــگ و تـــۆپی ڕژیمـــی شـــای بێ‌شـــەرم هەمبـــانەیە

بۆکان، زستانی ١٣٥٧ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# شاباز

ئەی سـەیدی کائینـات و جێـی شـانازی!
زێـدە لـە پەیـامبەران ئەتـۆ شـابازی

ئەم نـۆکەری خـاکی پـاکی بەردەرک و دەرت
پـاڕاوە لە لات، نەهـاتە جـێ داخـوازی

گەپجاڕی هەمـوو کەس و لە بەرچـاو کەوتـوو
فریـای نەکەوی، نەمـاوە پـۆز و نـازی

نـاڵێم منـی شەرمەسـار بڵنـدم بـە نەسـەب
سەرشـۆڕم ئەمـن، ئەتـۆ بڵنـدپەروازی

بـۆ خـواریێ دەمـێ نەزەر بفەرمـوو، قوربـان!
تـۆ خـاوەنی شـەققولقەمەر و ئیعجـازی

بـا هەسـتمەوە، لە گێـژ و خـول بێمـە دەرێ
ئیعجـازە فەقیـری وەکـوو مـن بنـوازی

نـاڵێم گلەیـیم هەیـە، ئەمـن قـابیلی چـیم؟
نـازی هەیـە "کامیـل"ت، ئەگەر تـۆ ڕازی

**قاقڵاوا، ١٣٣٥ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف مجبوب (وزن رباعی): مفعول مفاعیل مفاعیل فعل

# ئاردی نێو دڕوو

نیشتمانی خۆشەویست! بۆ پارەپارە و لەت کرای؟
تۆ مەگەر جەرگ و دڵی ئەمنی، بە حەسرەت دارزای؟!

هەرچی پارچەپارچە و لەتلەت بی، لای ڕۆڵەی وەتەن
هەر بەڕێز و حورمەتی تۆ، لای گەلت بەرزەقەڵای

تۆ بە دەستی دوژمنانت بوویە ئاردی نێو دڕوو
تۆ بە بای نەگبەت بوو وا هەر ڕۆژە بۆ لایەک برای

کۆچی لێقەوماوەکانت خوار و ژووری گرتووە
دێنەوە بۆ لات، دەزانن ئاخری هەر تۆ پەنای

هەر بە داخ و دەردی تۆوە پیر و لاو دەخولێنەوە
تۆ بە دەستی دوژمنانت گیانەکەم! بەشبەش کرای

سەد کەلاوە و لاڕووخاو و چاڵ و چۆڵ بی، نیشتمان!
بۆ گەلی ماڵکاول و بێچارە هەر جێگەی پەنای

من بە قوربانی کەژ و کۆی جوان و زەنویرت دەبم!
تۆ بەهەشتی سەر زەوی، تۆ لابەری جەور و جەفای

ئەی شنەی خۆشی بەیانانت لە سەر لووتکەی چیا
لابەری دەرد و خەمە، تۆ هێنەری سەیر و سەفای

"کامیل"ی پیرت دەسەودوعایە بۆ ڕزگاریی تۆ
چونکە بۆ هۆز و گەلی ئاوارە هەر تۆ ڕێنومای

قاقڵاوا، ۱۳۴۷ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# ئاڵووالا

چ شـــۆخە بەژنـــی بەرز و قەدد و بـــاڵای
جوانـــە ڕەوت و ڕۆیـــن و ئـــاڵووالای

حەقت بوو بەختی من، ئەی زولفی ڕەش‌مـارا!
کـــە ســـەرتاپێ لـــە بەژنـــی بەرزی هـــاڵای

ئەگەرچـی هەر دەخـــوێنم دەرســـی عیشــقی
بەڵام هـــــــەروا گرانیشـــــــە موتـــــاڵای

دڵـــم هەر کورکـــەکورکی بـــوو لـــە دووری
بڵێـــی جارێـــک بگاتـــە گـــوێی ســـکاڵای؟

ســـەراپا گەنجـــە لەنـــجەی موشـــتەری خـــۆم
بە کێـــی داوە "ئیمـــامی"! ئـــاخۆ کـــاڵای؟

گەردیگلان، ۱۳۲۰ی هەتاوی

---

بحر هزج مسدس محذوف: مفاعیلن مفاعیلن فعولن

# ساقی نەیە نابیٚ!

هەتاکەی عاشقی بیٚچارە چـاوی هەر لـە دەرگـا بـیٚ؟
بلیٚ بەشکەم وەدەربـیٚ ڕۆژی عاشـق، جـا بلیٚـی وا بـیٚ؟

بە سارد و گەرمی مەیلی یاری خۆم من ڕامبوارد عومریٚ
لە لای من بایی پوولیٚکـە، چ سـەرما بـیٚ، چ گەرمـا بـیٚ

بەرامبەر شەمعی ڕووی دلداری من با پیٚـت بلـیٚم چـۆنە
کەسـیٚ عاشـق دەبـیٚ، پیاوانــە وەک پەروانــە سـووتابیٚ

هەژار و دەربەدەر بـۆ کـۆیی دلـبەر سـەر دەبـا پـیٚ بـیٚ
بە سەر بـا بیٚمـە دەرکەوبـانی وی، تـا هیٚـزی پـیٚ مـابیٚ

موهەییا نـابیٚ بەزمـی عارفـان، پیـری موغـان فەرمـووی
هەزار عاشــق وەخــڕبن، تــاوەکوو ســاقی نەیـیٚ نــابیٚ

بە نەزم و نەسری خۆم هەر ڕیٚزی لیٚ دەگرم هەتا دەمرم
لە پیـری مەیـکەدە، بەشـکم بفەرمـیٚ پیـالەیێ بـا بـیٚ

"ئیمامی" مـاڵخراپ، چـاوی لە دەسـتی سـاقییە، تـاکوو
بە خـۆی و پیـالەکەی بیٚـتە پەنـام و مـالی ئـاوا بـیٚ

گەردیگلان، ١٣٢٨ی هەتاوی

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# بەفری خەم

بـا بـە یـادی شـەمعی ڕووت، پەروانـە بـێ
گیـانەکەم، دڵ بـێ دڵـت وێرانـە بـێ!

بەفـری خەم دیسـان لە سـەر کێـو کەوتەوە
ڕەنگـە پەڕ دەرکـات و لـێم دێوانـە بـێ

مـانگی جێـژن بـا ببـێ ئـاوا، بـە تـوون
ڕەببـی ڕۆژی ڕووت لـە مـن ئـاوا نەبـێ

تـۆ کـە لای مـن نـی، نەمـاوە زینـدەگیم
خێـر و خۆشـیم بۆچییـە هەر بـا نەبـێ

بێتـۆ کەی جێژنـە، هەزار مانـگ نوێـوە بـێ!
گەر ئەتـۆش بێـی، ڕۆحەکەم جێژنانـە بـێ

**قاقڵاوا، ١٣٣٩ی هەتاوی**

---

بحر رمل مسدس محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

## تۆبە بێ

من سـەگێکی ڕووت‌وقـووتی ڕانەکەی تـۆم، تۆبـە بـێ!
پەت لـە مـل، ئامادەباشـی شـوانەکەی تـۆم، تۆبـە بـێ!

تـــۆ تەبیبـــی حـــازیقی دەرد و بەلای، مـــن دەردەدار
دڵنەخـۆش و چـاوەڕێی دەرمـانەکەی تـۆم، تۆبـە بـێ!

برسـیی و بـێ‌واز و بێ‌هێـزم، لـە دەرکـت کەوتـووم
چـاوەڕێی لـوقمێکی چەور و نـانەکەی تـۆم، تۆبـە بـێ!

گەر بڵـێم لەو نەسـلە پـاکەم، خـۆ درۆ نـاکەم، بەڵام
ڕووی دەوێ لەو نەسلە بم، گـاوانەکەی تـۆم، تۆبـە بـێ!

نیسـبەتی خاشـاک لەگەڵ گـوڵزاری بـاغی جەننەتـت
چۆن بکەم من؟ خاکی دەرک‌وبـانەکەی تـۆم، تۆبـە بـێ!

تـۆ شەهەنشـاهی جیهـانیی و ئەمیـری ئیـنس و جـان
مـن فەقیـرم خـۆ، گەدای دەربـانەکەی تـۆم، تۆبـە بـێ!

هەستە "کامیل" ڕوو دە دەرکـی سـەییدی سـەروەر بـکە
هەر بڵـێ قوربـان! سـەگی ئاسـانەکەی تـۆم، تۆبـە بـێ!

جەمیان، ١٣٣٠ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# برایەتی

چەنـــدە بەنـــرخ و چاکـــە، بـــراکەم! برایەتـــی
چەنـد پیسـە، چەنـد گـڵاوە، کەسـی مـن! جیـایەتی

بـۆ کـورد جیـا لـە یەکتـر و تەشـویش و گیـرودار
یەک‌جـــار لەمێـــژە، دوور و درێـــژە حیکـــایەتی

هەرچەنـد زەمانـە جەوری لـە سـەرمانە، خـول دەدا؛
بـا ئەم خـــولەش نەکەیـن لەوی، گیانـە شـکایەتی

سوورێکی دیش بە سـوودی مە دەخـوا، سـەبر گـرە
تـــا ســـەر نییـــە گەدایەتـــی و پادشـــایەتی

جا تۆ کە ڕوونـە لێـت گەڕ و چەرخ‌وخـولی زەمـان
مەنوێنـــــە بێ‌مرووەتیـــــی و بێ‌کیفـــــایەتی

شێخ‌چۆڕیان، ۱۳۳۲ی هەتاوی

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# کۆچی خێر *

باری بەست، خێربێ، دەڵێن بۆ جەننەتولمەئوا دەچێ
هەرکەسێ پیاوی خودا بێ، گیانەکەم! ئاوا دەچێ

شێری مەیدانی خوداناسی عەلی بوو عائیلی
توێشوویی هەڵگرتووە، بێترس و بێپەروا دەچێ

ئەو لە پێش چاو چوو، بەڵام هەر ماوە وێنەی وی لە دڵ
هەرکەسێ وێنەی ئەوی بێ، خۆش سەروسیما دەچێ

خەم مەخۆن یاران! مەڵێن ڕۆیی "عەلی" شێری خودا
پاک و ڕووسوور بۆ حوزووری حەزرەتی مەولا دەچێ

هەرکەسێ ڕووسوورە وەک ئەو دەچتە مەیدانی جەزا
خۆ ئەوەی وەک "کامیل"یشە، بێسەر و بێپا دەچێ

**سەیدئاوا ، ١٣٤٧/١٢/٢٠ی هەتاوی**

---

* بۆ وەفاتی حاجی «بابەعەلی عائیلی»، خەزووری "ئاوات"
بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# شاری دڵ

مـــن دەڵـــێم شـــاری دڵـــم بـــاغ و گوڵســـتانە، کەچـــی
عەقـــڵ ئەڵـــێ نـــا، قەســـەبەی شۆڕشـــی مەســـتانە، نەچـــی

مـــن دەڵـــێم نـــوختەیی ئەو ڕەوزەیـــی ڕیزوانـــە، دەچـــم
ئەو دەڵـــێ نـــا، ڕەشـــە، جێڕاوگەیـــی شـــەیتانە، نەچـــی

مـــن دەڵـــێم مەســـکەن و ئـــارامگەیی جانانـــە، دەچـــم
ئەو دەڵـــێ سەربەســـەری تێـــکچووە، وێرانـــە، نەچـــی

مـــن دەڵـــێم جێگەیـــی هەر شـــێت و جنوونانـــە، دەچـــم
ئەو دەڵـــێ نـــا، زەدەیـــی پەنجەیـــی پەریانـــە، نەچـــی

مـــن دەڵـــێم مەرکەزی ئەســـراری حەریفانـــە، دەچـــم
ئەو دەڵـــێ جـــێ تەمەعـــی چـــاوی حەســـوودانە، نەچـــی

مـــن دەڵـــێم وەختـــی خەتەر مەئـــمەن و قەڵغانـــە، دەچـــم
ئەو دەڵـــێ کونکونـــە، جـــێگەی ســـەرەپەیکانە، نەچـــی

لەو هەموو چـــوون و نەچوونـــە ســـەری ســـوڕما "کامیـــل"
مـــن دەڵـــێم جوانـــە بچـــم، ئەو دەڵـــێ وا جوانـــە، نەچـــی

**قاقڵاوا، ۱۳۴۶ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# خەمێکی دی*

وەکوو بیستم خەمت خواردم، ئەویش بۆ من خەمێکی دی
دڵــت بــۆ مــاتەمم ســووتا، ئەویشــم مــاتەمێکی دی

دەمــێ نەمــدی لــە دنیــا هــاودەمێ، غەیــری خەم و دەردم
لــە کــوێ پەیــدا بــکەم یــارەببی! ئــاخر هەمــدەمێکی دی؟

بــە داخ و دەردی تــۆوە شــەرتە ئەی بــاڵابەرزا! بمــرم
دەبێ ئەو حەســرەتەی خــۆم مــن بەرم بــۆ عــالەمێکی دی

بە زولفی خەمبەخەم دونیات وەکوو چێوی خمــێ لێکــرد
کەچی بۆ گەردنــی ئەمنــت دریــغ فەرمــوو خەمێکــی دی

"ئیمامی"ت کوشت بە تیری غەمزە گەرچی چاوتە چارەی
تەماشــای گەر بفەرمــووی نــایەوێ قەت مەڵحەمێکــی دی

گەردیگلان، ۱۳۲۰ی هەتاوی

---

* وەرگێڕدراوی شێعری ئەبولقاسمی لاهووتی:

شنیدستم غمــم را می‌خــوری، ایــن هــم غــم دیگــر
دلــت بــر مــاتمم می‌ســوزد، ایــن هــم مــاتم دیگــر
به دل هــر راز گفــتم بــر لــب آوردش دم دیگــر
چه سازم تا به دست آرم جز این دل، محــرم دیگــر
مــرا گفتــی دم آخــر ببینــی، دیــر شــد، بــاز آ
که ترســم حســرت ایــن دم بــرم در عــالم دیگــر
جهــانی را پریشــان کــرد از آشــفتن یــک مــو
معــاذ اللــه اگــر بگشــاید از گیســو خــم دیگــر
به جــان دوســت غیــر از درد دوری از دیــار خــود
دریــن عــالم نــدارد جــان "لاهــوتی" غــم دیگــر
بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# ناڵەی بێدڵان

دڵێکـــی وام ئەمـــن نـــاوێ بـــە نـــاڵەی بـــێدڵان نەگـــری
وەکوو شەونم لە سەر خونچەی گوڵان بـۆ بولبـولان نەگـری

وەکـــوو بولبـــول نەبێتـــە عاشـــقی گـــوڵ، دڵ بـــە کـــار نـــایە
ئەگەر شـــێتانە ســـبحەینان نەچێتـــە ســـەر چـــڵان نەگـــری

لە بەهرە و شەوق و زەوق و خێر و خۆشی دوورە ماڵکـاول
دڵـــی وا بـــێئەوین، جارێـــک بـــە حـــاڵی عاشـــقان نەگـــری

شـــەوێ تـــا ڕۆژ دەنـــاڵێنن، لەگەڵ تەیـــری شـــەوا جـــووتن
دڵـــی وام بـــۆ چییـــە بـــۆ وان شـــەوێ تـــا بەربەیـــان نەگـــری

شـــــەوانە مەل دەخـــــوێنن بـــــۆ ئەوانەی دڵ برینـــــدارن
دڵم نـاوێ بـە دەنگـی پـڕ لـە سـۆزی وان، شـەوان نەگـری

بـــە هـــاتوچوونی شـــێتوپێتی دڵ بـــا پێکەنـــین، گەر ئەو
بـــــە ئامۆژگـــــاری زانایـــــانی پیـــــر و عـــــاقڵان نەگـــــری

لـــە مـــاڵێ قەت شـــەوانە ئـــۆقرە نـــاگرێ، ناســـرەوێ تـــاوێ
"ئیمـــامی" تـــا ســـبەینێ زوو نەچێتـــە نێـــو گـــوڵان نەگـــری

**قاقلاوا، ۱۳۴۷ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# بوڕاقی باڵدار

ئەی سـەراپای وجـوودت لـە هەمـوو عەیـب بەری!
تـۆ لـە تـاریفی مـن و هـۆنەری دیکـە بەدەری

تۆ ڕەسـووڵێکی، زەوی فەخـری بـە تـۆ بـوو لـە سـەما
مانگ بە ئەمرت لەتوپەت بوو، لەتـی بـۆ لات دەوەری

هێنـدە گەورە و بەشـکۆ هـاتی بـە ئەمـری یەزدان
هەچـی پێغەمـبەرە ڕاوەسـتن، ئەتۆیـان لە سـەری

ڕابەر و گەورە وو خـاوەن کەرەم و مەرحەمەتـی
سـفرەکەت حـاتەمی ونکـرد و نەمـاوە ئەسـەری

هەرکـە هـاتی هەمـوو زاڵـم لـە نەهـاتیدا چـوون
زۆری زۆردار بـە وجـوودی تـۆ نەمـابوو خەبەری

جوبرەئیل بـانگی دەکـردی کـە لـە دەوری مەکـە بـووی
کـوتی: فەرمـوو بـڕۆ، تـۆ خـاوەنی فەتـح و زەفەری

خـۆی نەگـرت کـافر و تەسـخیری مەکەت کـرد خێـرا
سـەری شـێوا و کونەمشـکی بە دڵ و گیـان دەکـڕی

ڕێـگەکەت دوور بـوو، بەڵام سـاڵی بـە سـاتێکی بـڕی
ئەو بـوڕاقی کـە بـە بـاڵان دەفـڕی چوویـە سـەری

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

هەچی دووی تۆ نەکەوت بەختی خەوت، ڕۆیی کەوت
تووشی بوو مەخسەرەوو نەگبەت و سەد دەردیسەری

شاسوارێکی وەها بووی هەموو ئاسمانان چووی
هەر مەلایک بوو بە پێشواز لە سەران دادەوەری

بە سڵاوات و بە تەکریم و بە تەحسین و ئەدەب
ڕادەوەستان و دەیانکوت: کە چ شیرینسەفەری!

چوویە ئەو جێیە کە جوبریلی ئەمین ماتڵ ما
جێی حوزوور بوو، لەوە بەولاوە نەمابوو گوزەری

لە مەسافا وەکوو کێویی و لە بەزلا بەحری
ئەی بە قوربانی بوڕاقت کە سەراپا هونەری!

موجیزەت زۆرە، لە ئەژمار بەدەرە بۆ "کامیل"
هەر ئەوەندە بەس کە دەڵێم: خاوەنی "شق‌القمری"

**قاقڵاوا، ۱۳۶۰ی هەتاوی**

# بەفری بەران

سـەیری چەنـدە سـەخت و ناخۆشـە بیسـاتی پـاییزی!
سەگ لە سەرمانا تەزی، شێریش لـە حانـد سـەرما بەزی

تەم لەگەڵ بەفـری بەرانـا وا سـەری کوێسـتانی گـرت
سـەر بەرەوژێـر، کەمکەمـە دێـوی سـپی بۆمـان خـزی

هـات گـورەی پیـاوی لەمێژینـە و درا جلکـی هەژار
کـار و مەڕ هەر کارەیانـە، بزنـەڕووتەش هەڵـبەزی

پیر و لاو، شێخ و مەلا، هەر حەز لـە تەنـدووریٚ دەکەن
ملهوڕیش دەڕوا بە ئەستۆی کز، بـە کـووڕی و مـل‌کزی

جاروبـاریش خۆزگـە خـۆ دەرخـا لـە نێـو هەور و هەڵا
زۆر بـە تـرس و لەرزەوە، زەردە بـە چاوشـارکیٚ و دزی

هـات نەسـیمێکی شـەماڵ و تـا وڵات ڕەش کـاتەوە
داوەشـیٚ! بـیٚ وادە هـات و وا ئەویـش گیـانی تەزی

قاقڵاوا، ۱۳۵۰ی هەتاوی

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

## ئاخری زەمانە

هەروا خوداخودامــە کــە ماوێــک ببــێ، دەمــێ
لەو قەبرە پڕ لــە ئێشــەوە دەرکەم دەمــێ خەمــێ

ڕۆژم وەکــوو شــەوانە، بــە تــاریکی ڕادەبــێ
شەو کوتر و کوێرم و نە چرایێک و نــە شــەمێ

ڕۆژم بـــە ئینتیـــزارەوە دەڕوا هەتـــا شـــەوێ
چ بکەم ئەمن؟ شەویش نە ڕەفیقێ، نە هاودەمێ

ســیرڕی دڵــم لــە بێکەســییا ڕەنگــە دەرکەوێ
هەرچی دەکەم نییە، نــە ئەنیســێ، نــە مەحرەمــێ

ڕۆژ و شــەوم بە جــارێ لەلا وەک جەهەنــنەمە
قــابیز لەبەرچــی نایەتــە لام ڕۆحمــی دەمــێ؟

"کامیل"! خەریکی چی؟ مەگە نەتبیستووە دەڵێن:
بــۆ ئــاخری زەمانــە شــوکور ماویــە دەمــێ

**ئاشی زەنبیل، ١٣١٥ی هەتاوی**

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# دافیعی ئەلەم

ئەتـۆی حەکیمـی هەمـوو دەرد و دافیعـی ئەلەمـی
ئەتـۆی کـە شـافیعی خاوەنگونـاهی زۆر و کەمـی

ئەتـۆی کـە ڕەحـمەتەکەی گرتـی دار و بەردی وڵات
وەخـرِدەکەی بە سـەخا و بەزل سـفرەکەی حەتەمـی

وجـوودی تـۆ بـووە زیبـی گـوڵ و دڵـی بولبـول
بە بۆنی تـۆوە گەیشـت، بـوو بـە نـۆکەر و خەدەمـی

وەنەوشە گەردنـی خـۆی کـرد بڵنـد لـە ڕاسـتت زوو
نەسـیمی سـوبح سـەری کـرد نەوی و دای قەسـەمی

کـە تـا وجـوودی هەیـە سـەرنخوون و مـلکەچ بـێ
سیاهـپەردە بـێ دایـم هـەتاکوو دێ عەدەمـی

کـە سوێسـنیش وەزمانهـات بڵـێ منـیش جـوانم
سـەبا بـە ئەمـری جەنابـت شـەپێکی دا لـە دەمـی

تەماشـە نێرگسـی خۆشـبەخت چـۆنی تەرتیـب دا
لە لایـێ حـوققە وو کـاغەز، لە لایەکـیش قەڵەمـی

لەبەر ئەوە کـە بنووسـێ لـە مەدحـی تـۆ دەفـتەر
ببێتـە زیبـی چەمەن، خـۆش بـێ هـاتنی قەدەمـی

**گەردیگلان، ١٣٣١ی هەتاوی**

---

بحر مجتث مثمن مخبوب محذوف: مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن

# سۆزی دڵ*

بــە تەنیــا گیــانەکەم! ســۆزی دڵــم پەروانــە دەیزانــێ
خەمــی دڵ بولبــولێکی بێ‌گــوڵ و بێ‌لانــە دەیزانــێ

وەهــا پابەنــدی بســکی شــێت‌وپێتم، بــێ‌خەبەر مــاوم
لە خــۆم و حاڵ‌وبــاڵم، حــاڵی مــن دێوانــە دەیزانــێ

لە ڕازی بســکی پــڕ پێچ‌وخەمــی، عــالەم سەراســیمەن
دەزانی ئەو تەلەســمە مووبەمــوو هەر شــانە دەیزانــێ؟

مەپرسن دۆستان! هەرگیز لە حاڵی دەستزەدەم، چــونکە
لە خــۆم مــن بــێ‌هەواڵم، حــاڵی مــن جانانــە دەیزانــێ

ئیمــامی نــاوی گەورە و شــاری وێرانــە کــە تێفکــری
لــە مەعنــای شــێعرەکانی هەر دڵــی وێرانــە دەیزانــێ

**گەردیگلان، ۱۳۲۳ی هەتاوی**

---

* وەرگێڕدراوی شێعری ئەبولقاسمی لاهووتی:

فقــط ســوز دلــم را در جهــان پروانــه می‌دانــد
غمــم را بلبلــی کــاواره شــد از لانــه می‌دانــد
به امیدی نشســتم شکوه‌ی خــود را بــه دل گفــتم
همی خندد بــه مــن، ایــن هــم مــرا دیوانــه می‌دانــد
تو آگه نیــستی کاندر ســر زلفــت چــه خون‌هــا شــد
ولــیکن مــو بــه مــو ایــن داســتان را شــانه می‌دانــد
نصــیحتگر چــه می‌پرســی عــلاج جــان بیمــارم
اصــول ایــن طبابــت را فقــط جانانــه می‌دانــد
به جان او کــه دردش را ز جــان هــم دوســتتر دارم
ولی می‌ســوزم از ایــن غــم، کــه دانــد یــا نمی‌دانــد

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# بولبولی ئاوارە

ئەی تەیـری دڵـی وەحشـی! تـا کەنگـێ پەرێشـانی؟
تـا کەی بـە هەوەس دەفـڕی؟ مەفتـوونی گوڵسـتانی؟!

هەرچەنـــدە بەهـــارت دی، ئەممـــا چ بەهـــارێکە؟
بێزەمزەمەیـــە بەزمـــی، بێڕەونەقـــە بوســـتانی

گـوڵ کـاتی خەزانـی هـات، بولبـول هەمـوو ئـاوارەن
ئـاوازی حەزینـی نەی، گـوێ بگـرە لـە ئینسـانی

شـەو بـۆنی نییـە شـەوبۆ، بولبـول بە تەمـای چـی بـێ؟
هەڵنیشـێ بـە ئوممێـدی خـونچێکی سـبەینانی

گـوڵ بۆتـە دڕوو، قەولـیش پـاک بوونـە درۆ ئەمسـاڵ
کـوا یـاری وەفـادارم، دەسـت و دڵـی جـارانی؟

ڕەحـمەت لـە غەم و دەردم، بەو دووانـە ئەمـن ناسـیم
پـاکی کەس‌وکـاری خـۆم، یـاری بـە مەسـەل گیـانی

داخـۆ لـە چ لایێکـە ئەو یـاری کـە ڕووخۆشـە
گوێچکەی فەلەکی کەڕ کرد، کـوا کـۆمەک و ئیحسـانی؟

کـوا نەعرەیـی شـێرانەی لەم کاتـە کـە دامـاوم؟
لەم بەحـرە کـە خنکـاوم کـوا هیممەتـی جـارانی؟

---

بحر هزج مثمن اخرب: مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن

تۆخوا بڵێ بەو شەخسە، جاران کە دەهات دەیکوت:!
مـــن یـــاری وەفـــادارم، دەســـتی مـــن و دامـــانی!

ئەمڕۆکـــە گڵـــۆڵەی مـــن کەوتۆتـــە ســـەرەولێژی
هـیچ‌کەس نییـە خـاس بێـژی، تـا خـۆ کەمـە قوربـانی

خێرایەکـــی هەســـتێ بـــێ، پیاوانـــە، مـــن و دڵ زوو
لەم گێـــژ و خـــولی چەرخـــە دەربێنـــێ بە ئاســـانی

هـــیچ‌کەس نییـــە هاوارکـــا "کامیـــل" لە چ لایـــێکە
بـۆ کـوێ چـووە بێ‌چـارە؟ کـوان هەمـدەم و یـارانی؟

**جەمیان، ١٣٣٠ی هەتاوی**

# مەنجەڵی دڵ

وەکوڵ هات مەنجەڵی دڵ، دەس‌بەجێ ئەی دیـدە گریـانێ!
دەبـێ برژێنـی ئـاخر، چـاوەکەم! دورڕێ بـە دامـانێ

لـە سـایەی سـۆزی دڵ ئەمڕۆکـە چـاوم هێنـد دڵاوایە
لە گەوهەر پڕ دەکا ئەو، دەست و کۆشـی هەر موسـوڵمانێ

ئەمـن خـۆ کۆشـی خـۆم پڕکـردووە، هەڵناگرێ چیـدی
جەهەننەم! ئەی ڕەقیبی بەدمەزەب، تۆش کۆشی خۆت دانێ

کە چاوم بۆتە گۆمی خوێن و خوێ، پرسیم لـە هـاودەردێ
لەگەڵ دەریا ـ کوتی ـ بەستوویەتی چـاو مەرج و پەیمـانێ

کە "کامیل" خـوێن دەبـارێنێ لـە چـاو، ئەی بێ‌وەفـا یـارم!
حەکیمی دەردی وی هەر تـۆی؛ کەرەم کـە تـۆزە دەرمـانێ

**قاقڵاوا، هاوینی ١٣٥١ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# کەی بەهار وایە؟

کەی بەهــار وایــە گــوڵم! خونچــە دەمــیٚ پێنەکەنــیٚ
بولبــولی دڵ بــە شــنەی خۆشــی بەیانــان نەشــەنیٚ!

قەت بووە عاشقی وەک وی لە سبەی تـاکوو شـەویٚ
بــە تەمـا بێـت و کەچـی مـاچێکی لێـوی نەدەنـیٚ؟

گــوڵی ئەوســاڵی وەریــوە، گــوڵی پاریشــی چــووە
مەگـە کـای پارەکـە وەک ئێمـە بـە بـا کـا بـە شـەنیٚ

پەڕوپـۆی پـاکی وەریـوە لـە خەمـان، کـوا مەلـی دی
ببنـە هـاواڵی خەمـی؟ تـازە لـە کـویٚ پێـی دەگەنـیٚ؟

ئەو هەژارە کــــە ئەوەنــــد تــــامەزرۆ مــــاوەتەوە
مەکە لۆمەی کە لە نێـو دڕکـە، بـە دۆش هەر دەژەنـیٚ

ئەمنــــیش کونــــدم و هەر کوێێـــــە دەچـــم وێـــرانە
وەکــوو تاقتـاقکەرە خــۆم مــامەوە لێــرە بــە تەنــیٚ

ڕیشــەکەی خەڵفــی هیــوای کــاکی "ئیمــامی" پرســن
وا پــواوە، بــە ســەری ئێــوە، بــە فــوو هەڵــدەکەنیٚ

قاقڵاوا، ١٣٤٨ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلاتن فعلن

# وەرەوە گیانە*

کێیە وەک تۆ لە مەبەست ڕامێنێ؟
بیر و باوەڕ بە گەلی بنوێنێ

لە قوڕی نەگبەت و چاڵاوی ستەم
شەڕەکەی خۆی و گەلی دەربێنێ

کێیە وەک ئێوە بە بیروڕا بێ
مافی کوردان بە قەڵەم بستێنێ

دڵم ئاوێنەیە ئەی "گەورەی دین"!
جاروبار دیمەنی تۆ دەنوێنێ

وەرەوە بۆ وەتەنی کوێستانت
چ دەکەی تۆ لە هەوای گەرمێنێ؟

بۆ ئەوەی تۆزی نەبێ ڕێگاکەت
چاو دەکا تکتکە ئاوپڕژێنێ

بۆ سڵاوێکی لە هاوڕێکانت
دڵەکەم کۆتری هەڵدەفڕێنێ

---

* بۆ دۆستێک کە بە ناچاری چووبووە گەرمێنێ
بحر رمل مسدس مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلن

وەرەوە گیـــــــانە، هەواخـــــــوات زۆرن
یەک لەوان هـــــۆنەرە بـــــۆت دەخـــــوێنێ

کــوڕی کــورد هەروەکــوو خــۆی مــاوەتەوە
تــــــــۆوی داوات لە وڵات دەڕوێنــــــــێ

هەر بە ئـــــــاواتەوە مـــــــاوم قوربـــــــان!
تـــــاوەکوو بـــــاغی هیـــــوا بەر دێنـــــێ

بولبـــــولی بـــــاختە ئـــــاواتی پیـــــر
هەر بە ئـــــــــاواتەوە دەچریکێنـــــــــێ

**قاقڵاوا، ١٣٦٠ی هەتاوی**

# ئەی نەمامی تازە

وەرە ئەی نەمــامی تــازە! تــۆ لــە بــاغی کــێ ڕوواوی؟
کــە ئەوەنــد شــۆخ و شــەنگی، لــە چ کـانێ ئـاو دراوی؟

دەم و چاو و بەژن و باڵا، هەمـوو ڕێکوپێـک و مەوزوون
هەمـــوو دڵڕفــێن و شــیرین، کـــە لـــە جوانییــا تەواوی

لـــە دڵــی هەژاری عاشـــق هەر ئەتـــۆی و خۆشەویســـتی
چ بکـا لـە پارچــە گۆشـتێ، کـە بـە زۆری تێـیخـزاوی

تۆ و ڕۆح و بیر و باوەڕ، تۆ و قەسـت و عیشـق و ئامـانج
چییــە ئەم تەلەســمە ئـازیز، لـە هەمـووی کـە تـێکەڵاوی؟

شەو و ڕۆژ بە یادی ڕووی تۆ، نە خەوم هەیە نـە خـۆراک
بەڵێ، دەستی قودەرتێ بـوو کـە لـە عەیـب و عـار بـڕاوی

دڵــی مـــوبتەلایی "کامیـــل" کـــە ئەتـــۆی تێیـــا دیـــاری
چ جـــوان و ڕوون و خۆشــە، تـــۆ چـــرای و هەڵکـــراوی

**قاقڵاوا، ۱۳۳۳ی هەتاوی**

---

بحر رمل مثمن مشکول: فعلات فاعلاتن// فعلات فاعلاتن

# گوڵی هیوا

کــێ دی وەهــا لەپــڕ گــوڵی هیــوا بپشــکوێ!
نەورۆز و ڕۆژی خۆشـیی گەلـی کـورد وەدەرکەوێ

ڕۆژی نەجــاتە، کــاتی خەبــاتە، فریشــتەکەت
کــوردە! ئەگەر نەترســی ســەری نــاوەتە ســوێ

هەر چـاوەڕێی خەبـاتی مـن و تـۆیە کـاکی خـۆم!
مــن حــازرم ئەگەر کەســێ بێــت و ڕەگەڵکەوێ

شــەرتە نەدەم وچــان و وەنەوز و خەوم نەبــێ
هەر نەســرەوم دەمــێ، لە بەیـانی هەتــا شــەوێ

تــا کفنــی دوژمــنم نەبــڕم، نەیــکەمە بەری
نەینـێمە گـۆڕی پیسـی، نەڵـێم ژینـی خـۆم دەوێ

داری هومێــدی کــوردە بە خــوێنی گەل ئــاو درا
تــاکوو جیهــان جیهــانە، ســەری بەرزە، نــانەوێ

تــازە چــرۆ دەکــات و بەریشــی بەڕێــوەیە
هەر ســاڵ بە بــای بەهــار دەشـنێت و دەبـێ نـوێ

تـاکوو تەنـوورەکەت دەگـرێ، کـاری خـۆت بـکە
نەک بێـتە کـۆتی پێـت پـنە، گەر تـۆ هەڵـت دەوێ

---

بحر مضارع مثمن اخرب مكفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعيل فاعلن

هەڵکەوتــووە، لە دەســتی مەدە هەل، هەڵــێ مەڵــێ:
نــارۆمە پێشــێ، ببــزوو؛ لە ڕۆحــی منــت کەوێ!

هەرگیــز مەهــێڵە دامــرێ تەنــدوورەکەت لە گــڕ
بەو تینــی گەرمــی وی، دڵــی دوژمــن دەبــێ تــوێ

پــێ هەڵگــرە، درەنــگە، نەوەک دامــرێ، بــڕۆ
کــاکی "ئیمــامی"! تــۆ کە ژیــانی گەلــت دەوێ

قاقڵاوا، هاوینی ١٣٥٦ی هەتاوی

## ئاواتی هۆنەر*

هەر کـــاتی نەوبەهـــارە کە دنیـــا دەکـــا نـــوێ
ســارا دەپۆشــێ بەرگــی ســەوز، گــوڵ دەپشــکوێ

شەوبۆ و هەڵاڵە، نەرگس و نەسـرین و نەسـتەرەن
سوێســنە زمــانی گرتــووە، پــێم ســەیرە نــادوێ

تــۆوی هەمــوو شــتێک لە بەهــارا ســەوز دەبــێ
ئەی تۆوی ئـێمە بـۆچی لە هـیچ فەسـڵێ نـاڕوێ

بــۆچی لە ئاســـۆ نـــایەتە دەر ڕۆژی مە خـــودا؟
ڕۆژی خەڵــک کەچــی ســەری وا نــاوەتە ســوێ

هەرچەنـــد لەمێـــژە خەڵفـــی هیوامـــان چەقانـــدووە
ئـــاوی بە خـــوێن دراوە، کە هەر ســـەوزە، نـــاپوێ

تـــا بەهـــرەوەر نەبـــێن لە بەری، هەر بڵنـــد دەبـــێ
وەک پیـــرەداری دی نیـــیە، هەر خەڵـــفە، نـــانەوێ

هەرکەس هیوای بە خۆی و گەلی ماوە ئێستەکەش
ڕەببـــی قەزای بە تـــاقی تەنـــێ هەر لە مـــن کەوێ

ئـــاواتی بـــۆچی نـــایەتە دی پیـــرە هۆنەرێـــک
هەر ئـــاخ و داخیـــیە لە بەیـــانی هەتـــا شـــەوێ

**بەهاری ۱۳۶۸ی هەتاوی**

---

* لە سەر جێوبانی مردنی گوتوویەتی.

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# دوعای ڕۆژان*

هەر ڕۆژ هەڵات، دوعا و تەمەننامــە تــا شــەوێ
کاکە! قەزات لە خۆم و لە هەرچی هەمە کەوێ

قوربان! بە زاتــی پــاکی خوداوەنــدی زولــجەلال
گەر بمــدەنێ بەهەشــتی بەریــن، بێ‌تــۆ نــامەوێ

جــاه و جەلال و ژیــن و حەیــاتم بــە تــۆوەیە
بێ‌تۆ وجوودی من چییە؟ کەوتــووم ئەوا لەوێ

کاکــە، هومێــدی مــن بە خــودا وایــە بەو زووە
ســەروی قەدت لــە بــاغی ئەماندایــە، نــانەوێ

ڕەببــی نەوی نەبــی، نەنەوی، ون نەبــی لە چــاو
نەچیە دەرێ لە دڵ، کە دڵــم هەر ئەتــۆی دەوێ

هەرکەس بە تۆ دژە، نەبێ یاڕەب لە سەر زەوی
کوێر و زەلیل و کەڕ بێ، کەسێکی ئەتۆی نەوێ

ڕۆحــی نیســاری خــاکی بەری پێتــە "کامیــل"ت
بۆ چاوەنۆڕی ســەروی قەدت بــۆچی نــاتەوێ؟

**قاقڵاوا، ١٣٥٣ی هەتاوی**

---

* بۆ خزمەت «حاجی سەید محەممەد نوورانی»

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

# ڕۆیی*

دەڵـێن یـارم لــە بۆکـانێ بــە سـەد ئـاه و فوغـان ڕۆیـی
زەدەی پەیکانی حەسرەت بـوو، وەکـوو تیـری کەوان ڕۆیـی

بــرام سەردەســتەیی پــاکی ڕەفیقــانی جەفــاکێش بــوو
نەمــابوو هــاودەمی، بۆیــە لە دووی کــاروانی وان ڕۆیــی

لەگەڵ ئەهلـی وەفـا "سـادق" بـوو، سـەددیق! بـابی ناکامـت
لەبەر نارێــکوپێکی مەوقیــع و کــات و زەمــان ڕۆیــی

لەگەڵ خاوەنْدڵان هاودەم، لەگەڵ ڕاس، سەروی بوستان بـوو
لەبەر بێبەرگوبــاری و ڕەنــگ و بــۆنی گوڵسـتان ڕۆیـی

مەڵـێن بـێواده بـوو ڕۆیـی، شـەهیدی عیشـقی جانـان بـوو
بــە دەنگــی بولبــولی بــاغی بەهەشـتی جاویــدان ڕۆیــی

"قزڵجـی" مـاڵی ئـاوا، کـانی فەیـز و عـیلم و زانـین بـوو
لە جێی خۆی "سـادقی" دانـا، ئەویـش زوو، ناگەهـان ڕۆیـی

بە دوایدا داغـــدارانی مـــوحەببەت کـــاروان ڕێخەن
بنێــرن بــاری دوعــا، ســەروەری دانیشــوەران ڕۆیــی

---

* بۆ کۆچیدوایی خوالێخۆشبوو «قازی کاکەحەمە»
بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

هونەرمەنـــد و ئەدیـــب و فـــازل و دانیشـــوەر و شـــاعیر
ڕەفیقی زۆر لە سـەر شانسـووکی هەر پیـر و جەوان ڕۆیـی

ئەگەر تەوریزە تەبڕیـژ، بـۆ تەبـی وی کەم نەکـرد تـۆزێ؟!
ئەتیببا کـوێر و دەرمـان قـات بـوو، وا ئەو بێوچـان ڕۆیـی؟

کە دی گەردنکەچە بولبول، لـە حەسـرەت ڕۆژگـاری گـوڵ
ئەویش دڵ پڕ لـە کـوڵ خێـرا لە پـێش کـاتی خەزان ڕۆیـی

"ئیمـــامی"ش بـــا بە دووی‌دا هەر بکـــا زاری هەتـــا مـــاوە
بـــە زاری بـــانگی هـــاواڵان بکـــا: ئـــارامی گیـــان ڕۆیـــی

بەهاری ١٣٣٨ی هەتاوی

# کاری وا ناکەی

خـــودا! بـــۆچی منـــی بێچـــارە بـــێدەرد و بەڵا نـــاکەی؟
ئیلاهی! بۆچی دەردی من بە ڕەحمی خۆت دەوا ناکەی؟

شـــەوێ تـــا بەربەیـــان یـــاڕەب! تەمـــادارم لـــە دەرکـــی تـــۆ
لەبەرچـــی مـــن بـــە خاســـانت شـــەوێکی ئاشـــنا نـــاکەی؟

ئەگەرچـــی زۆر گوناکـــار و هەڵەم، ئەممـــا ئەتـــۆ یـــاڕەب!
کەریمـــــی و جەزام لێناســـــتێنی، کـــــاری وا نـــــاکەی!

فەقیـــر و دەســـتەوئەژنۆم و ئەتـــۆ کـــاتی کەڕەم، ڕەببـــی!
دەزانم فەرقـــی خـــاوەن تـــاج و تەختێـــک و گەدا نـــاکەی

دڵی هەر بۆیە خۆشە "کـامیلی" بێدەســـت و پـــێ ئێســـتێ
کە فەرقـــی ڕۆســـتەم و پیـــاوێکی وا بێدەســـتوپا نـــاکەی

**قاقڵاوا، ١٣٤٠ی هەتاوی**

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

# ئەی خودا

دەمکـــوژی بەم دەردەوە یـــا چـــارەیی دەردم دەکەی؟
ئەی خــودا هەر هەڵـوەدا و موحتــاجی نـامەردم دەکەی؟!

هەروەکــوو جــاران لە ســەر تەختــی مــرادم دادەنێـــی؟
یا نە، شووم و ماڵخراپ وەک کوندی سەر بەردم دەکەی؟

دەمکەیـە مەجنـوونی عـالەم، دڵ بـە دەسـت دێـنم؟ وە یـا
عاشــقی ڕوخســاری لەیــلا، وێڵــی هەر هەردم دەکەی؟

مــن بـە دڵگەرمـی لەمەولا دەچمـە نێـو گـوڵزاری عیشـق
یا نە، مەحرووومم لـە گوڵشـەن، مـات و دڵسـەردم دەکەی؟

ئەی خـودا! جـاران بـە لوتفـت هـیچ خەم و دەردم نەبـوو
ئێسـتە بێلـوتفی، کـە تووشـی سـەد خەم و دەردم دەکەی

زوو لە نێــو خۆشــبەختەکان تاقانــە بــووم و بێنیــاز
ئێســـــتە لای پەژموردەکـــــانی دڵبەخەم، فەردم دەکەی

گەردیگلان، ١٣١٩ی هەتاوی

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

# ڕۆژگاری تاڵ

گـڕی تەنـووری کلـۆڵیم بەتـین بـوو، بوومـە پـنەی
نزیــک بــوو دەرچــێ گیــانم لەبەر گــڕ و گــڕپەی

کەچـــی بەداخەوە ترشـــا هەویـــر و پێـــزی نەمـــا
منـیش کـە ڕۆییبـوو هێـزم، کـوتم ئەجەل، سـا دەی

لـە سـاڵی سـیویەکەوە تـا گەیشـتە پەنجـا و پێـنج
نەبــوو ســەعاتێکی ئاســوودە بــم، بڵــێم ئــۆخەی!

چ ڕۆژگــارێکی تــاڵ بــوو کــە مــن تێیــا دەژیــام
لــە کــاتی ڕۆژ و شــەوان هەر کــوتم خودایــا وەی

بــە ئــاخ و داخەوە نوســتم، بــە ئێشــی دڵ هەســتام
دڵــم ئەوەنــدە زەعیــف بــوو، لەپــڕ دڕا پەردەی

کڵــۆڵی دەوری تەنیبــووم، نەمــابوو ڕێگــە هەڵــێم
نیشــانیدا بــە منــی هەڵــوەدا خــودا ڕێــگەی

بە پیـری مەرگەوە ڕۆیـیم، کەچـی بـە لـوتفی خـودا
نەسـیمی ژینـی نـوێ هـات، ژیـاوە دڵ بـە شـنەی

گەڕاوە لام هەمـــوو فکـــر و خەیـــاڵی ڕابـــردووم
بە زیکری حەول و قەوەت بۆ خودای باقیی و حەی

بـــە پیـــری کەوتییـــە چـــاڵ و نەجـــاتیدای یەزدان
لە بیـــری قەت مەبەوە تـــۆ ئیمـــامی! تـــاکوو هەی

قاقڵاوا، ۱۳۵۵ی هەتاوی

---

بحر مجتث مثمن مخبون محذوف: مفاعلن فعلاتن مفاعلن فعلن

# پاڕانەوە

سەگێکی دەمڕەشی بێ‌کەڵپە، پیر و کوڵکن و نووزن
دەسووڕێ خوێڕییە! کۆڵان بە کۆڵان، سەد کون و قوژبن
چڵێس و گورگەمێش و بێ‌وەڕ و بێ‌پاسی هەروەک من
بە کاری چی دێ یارەب! غەیری بەخشین و قەبووڵ کردن؟
بەغەیری پەت لە ئەستۆ خستن و بۆ دەرکی خۆ بردن!

بە تۆ نازیوە تا ئێستا، پەتی لەستۆ خە، ڕایکێشە
ئەگەرچی سەد شتی منداری خوارد وەک پێستە و پێشە
بەڵام موستەوجبی ڕەحمە دڵی پڕدەرد و پڕئێشە
بە سەرسەختی ژیاندت ماوەیەک، بۆیە جگەر ڕێشە
گڵاوە، چی دەگەڵ دێ؟ غەیری بەخشین، پیرەسەی کوڵکن!

سەگێکە گەرچی بێ‌پاس و وەڕە ئەمما وەفادارە
بە دار مۆخی دەرێنن، دێتەوە بەردەرکی تۆ دیارە
لە دەرکوبانەکەت هەڵناگرێ دەس، چونکە ناچارە
بە بەردی شوانەوێڵەش گەرچی ئەندامی بریندارە
کە خواردی نانی شوانی، دیارە بێ‌قەدرە سەگی نەوسن

---

بحر هزج مثمن سالم: مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

بچــۆ بەردەرکــی خــاوەن خــوان و بەخشــین، یــانی ئەو زاتە
ئەوەی خــاوەنزەمــان و مانــگ و ســاڵ و کــات و ســاعاتە
نییــە وێــنە و نەزیــری، هەر هەیــە و هەر بووشــە؛ ئیســباتە
بە هیچــــێ دایمەنــــێ تــــا داتنەنــــاوە ئەم دەم و ســـــاتە
کــە تــۆپی، بــێڕەواجــە کلکەســـووتێ، یانــە پــاڵکەوتن

ئەتـۆش "کامیـل"! سـەگی، ئەممـا سـەگی بـێکـار و بێپاسـی
بــە گۆشــتی پیســی منــدار خواردنــە تــۆ وا کەڕ و کاســی
بە قوززەڵقـورت و دەردت بـێ، زگـت وەک ماسـی هەڵماسـی
عەجەب یــــانیگرێکی، خــــاوەن و بێگانــــە ناناســــی
نیشــانەت دەرکەوت، هێنــدەت نەمــاوە بــۆ دەمــی مــردن

**قاقلاوا، ۱۳۶۵ی هەتاوی**

# بەهاری تازە

وا هــات بەهــاری تــازە، شــنەی بــای شــەماڵە دێ
ناقووســـی ژینـــی پـــڕ لە هیـــوای کیژۆکـــاڵە دێ
قاســـپەی کەوی بنـــار و کەژ و کێـــو و یـــاڵە دێ
کـــۆتر لە ســـەر ڕەوەز بە گـــمە و ناڵەنـــاڵە دێ
جـــیکەی مەلە، هەرایە، وشـــەی بـــاڵی داڵـــە دێ

شـین بـوو زەویـی و مـێگەلەمەڕ ڕۆیـی بـۆ لەوەڕ
پـڕ بـوو لە کارەکـاڕی مەڕی شـیو و دەشـتودەر
شـــوانان کەپەنکـــی تـــازەیی خۆیـــان دەکەن لەبەر
هەڵـــدێنە نێـــو هەوارەوە کیـــژان بە جلکـــی تەڕ
بـــارانە، بـــایە، گورەگـــوڕی هەوری تـــاڵە دێ

ڕێـک چیـغ و چـادرن دەدرەوشـن لە سـەر چیـا
وەک خـاڵی ڕەش دەچـن کە لە سـەر ڕوومەتـێ درا
ڕنـدوو لـە هەرکـوێ مـا، کـوڵی فرمێسـکی هەڵـرژا
بەو بـۆنە چـا بـوو خـۆ کـوڵی دڵ تـۆزێ دامـرا
کـــاتی هەوارە، قیژەیـــی کابـــانی مـــاڵە دێ

دونیـا وەکـوو بەهەشـتە سەراسـەر بـووە گلـووک
خـونچە کە دەسـتنەخوردەیە وا بـۆتە تـازەبووک
هەرکەس گوڵێـک بە ڕۆح نەکـرێ پێـی دەڵـێن چرووک
کـاتی نەمـاوە کـاکە! خەم و ئـاه و نووکەنـووک
کیـژان لە گـوڵچنین و بـزەی چـاوی کـاڵە دێ

---

بحر مضارع مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

تیپــی گــوڵان گەیشـــت و وڵات بـــوو بە زێـــو و زەڕ
بولبــول بە جــۆش و کــوڵ لە نێــوان شــەو دەبــاتە ســەر
شـــەونم لە ســـەر چلــۆپی گــوڵان کەوت و بـــوو بە بەر
نەرگــــــس بە بەرگـــــی زەردەوە هێنـــــاوییە خەبەر
یـــــانی گوڵاڵەســــــوورە لە خــــوێن‌دا شـــــەڵاڵە دێ

ئەمنــــــیش هەژار و دڵ‌بەخەم و چـــــاوەڕێی پەیـــــام
کـــێهە پەیـــام! پەیـــامی ڕەفیقـــانی وەک بـــــرام
پـــــارامەوە لە خـــــالیقی بــــوون و نەبــــوون، بەڵام
هەروا بە داخەوە گــــــــلەمە، هەر نەبـــــــوو وەڵام
وێـــــرانە ماڵ‌وحـــــاڵ و ســـــەدای کونـــــدەلاڵە دێ

خوێنــدی لە گوێســوانەیی تــالاری ســەوز و ســوور
وێرانــی کــرد و تێــک‌چوو، نەمــا کۆشــکی پــڕ ســروور
دەگـــــڕێ دڵـــــی هەژاری "ئیمـــــامی" وەک تەنـــــوور
دەگــری، دەڕێــژێ خــوێنی گەشــی دڵ لە خــوار و ژوور
هەرکــــــوێ دەچــــــی لە دووری ئەوان زاڵەزاڵە دێ

**بۆکان، ۱۳۴۷ی هەتاوی**

# شین و پێکەنین

ئەو عالەمە چی لێ‌هات؟! جاران کە ئەمن دەمدین
سەرگەرمی ئەوین، جارێ دڵخۆش و دەمێ غەمگین
گا پێدەکەنین وەک گوڵ، جارێکی دەیانکرد شین
بۆ لەیلی و بۆ مەجنوون، بۆ خوسرەو و بۆ شیرین
هەروەک چووە پێش چاوان کاکەمەم و خاتووزین

هەرکەس بە خەیاڵی خۆی سەرگەرم بە کارێ بوو
گیرۆدەیی میهر و مەیل، ئاشوفتەیی یارێ بوو
عاشق بە سەری زولفی بێ‌تاب و قەرارێ بوو
خاتر لە سەری رێگای ئاهوویی تەتارێ بوو
ئێستاش لە فیراقی وان، من رۆح و دڵم دەگرین

کوا بولبولی بێچارە تا بێتەوە گوڵزاری؟
گوڵ پێبکەنێ بۆ وی، ئەو ناڵە بکا و زاری
بولبول بە سەناگۆیی، گوڵ هەر بە جەفاکاری
بۆچی؟ ئەوە بوو مایەی شەیدایی و دڵداری
بۆیە لە گوڵ و گوڵزار باڵندە هەموو دەفڕین

---

بحر هزج مثمن اخرب: مفعول مفاعیلن// مفعول مفاعیلن

ئەو عاشـــــقی بێچـــــارە وا بــــــێپەڕ و بێبــــــاڵە
یـــارەببی! چلـــۆن بفـــڕێ؟ پێبەنـــدی خەت و خـــاڵە
مەجنـــوون‌ســـفەتە و عاشـــق بەو لەیلییـــە ڕەشـــتاڵە
یـــا بـــۆ شـــەکەری لێـــوی عەیـــنەن وەکـــوو منـــداڵە
ڕۆژ و شـــەو و بێوەختـــان ئەو مـــاڕزە دەگـــرێ قـــین

دەرچـــوونی مەحاڵـــە دڵ، لەم گێـــژ و خـــول و چەرخە
چـــون کـــۆزی ئەوە هێشـــتا، ســـاوایە، وەکـــوو بەرخە
یـــارەب! بە کەرەم جـــارێ، لوتـــف و کەرەمـــت دەرخە
لەم سەخت و چڕی چەرخـــە، ئەم عالەمـــە زوو ســـەرخە
ئەی مـــن بە فیـــدای خـــاکی بەردەرکـــی "ئیمـــامی" دیـــن

گەردیگلان، ١٣١٨ی هەتاوی

# مەگرە بەهانە

قوربـــانی بـــرۆتم کەســـەکەم! چەشـــنی کەوانە
تیـــری مـــوژەکەت بـــۆچی دڵـــی کـــردە نیشـــانە!
لێـــــتداوە لـــــە دوو لاوە کە وا هێنـــــدە بەژانە
خـــوێنی بـــدە لەو دەســـت و ســـەر و پەنجـــە جـــوانە
بۆچیتـــە خەنـــە؟! تەڵخـــە؛ بەســـە، مەگـــرە بەهـــانە

ســـەیری کـــە لـــە پەروانـــە کـــە ڕەفتـــاری دڵـــی دی
بڕوانـــە کـــە پەروای نەبـــوو، ئەســـراری دڵـــی دی
ســـــووتاوە پەڕوبـــــاڵی کـــــە ئەنـــــواری دڵـــــی دی
دێـــوانە وو سەرســـامە کـــە ئاســـاری دڵـــی دی
بەو حاڵەشـــــەوە دڵ کەچـــــی مەیلـــــی بە گەڕانە

هەر دێت و دەچێ لێـــر و لەوێ، بـــێ‌کەس و بـــێ‌دەر
عاشـــق بـــە هەمـــوو خـــونچەدەم و قەددی ســـنەوبەر
هەر قـــامەتی ڕەعنایـــە دەبینـــێ، وەکـــوو نـــۆکەر،
دووی‌کەوتـــووە، بێ‌چـــارە وەکـــوو شـــێت و قەلەنـــدەر
دانـــاکەوێ بـــۆم هەرچـــی دەڵـــێم، دەردی گـــرانە

لەم کاتـــە کـــە بـــاری لـــە ســـەما لوئلـــوئی لالا
ســـەرپاکی چیـــا بۆتـــە گـــوڵ و نێرگســـی شـــەهلا
هەرکەس بـــە خەیاڵێـــک و بـــە فکـــرێکەوە هـــاڵا
دڵ هەر لـــە خەیـــاڵی ســـەر و زولـــف و قەد و بـــاڵا
دێوانـــــە ئەوە ئەو؛ دەگەڕێ خانـــــە بـــــە خـــــانە

---

بحر هزج مثمن اخرب مکفوف محذوف: مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

زســـــتان کـــــه زەیســـــتان بـــــوو، بەری خســـــتووە ئەمـــــڕۆ
هەر لاخـــــڕ و شـــــیوێکی تەماشـــــا بـــــکەن ئەنگـــــۆ
نـــــوتفێکی فـــــڕیداوە فەقیـــــرە بـــــە ســـــەری تـــــۆ
دێ دەنـــــگ و هەرا و شـــــیوەن و نـــــاڵینی بـــــە ڕۆڕۆ
بـــــای وادە دەدا مـــــوژدە: ئەوا کـــــاتی گـــــوڵانە

تـــــاکەی بـــــە هومیـــــدی مەدەدێکـــــی ئەم و ئەو بـــــین
دواکەوتـــــوو لـــــە هەر خێـــــڵ و لـــــە کوێســـــتان و لـــــە زەو بـــــین
تـــــاکەی کەســـــەل و تەمـــــبەڵ و هێنـــــد کوشـــــتەیی خەو بـــــین
وەک شەمشـــــەمەکوێرە بـــــە هەوا عاشـــــقی شـــــەو بـــــین
شـــــەو ڕۆیـــــی، بەســـــە؛ هەســـــتە ئەوا کـــــاتی بەیـــــانە

هەرکەس کـــــە فکـــــر کـــــاتەوە لەم مەوقیعـــــە خۆشـــــە
خـــــاوەن دڵ و گـــــوڵ بـــــێ، وەکـــــوو بولبـــــول بەخرۆشـــــە
هەر ســـــۆفیی بـــــێکارەیـــــە وا ئێســـــتە خەمۆشـــــە
لێـــــی لادە، کـــــە لەم مەوقـــــیعەدا وا بـــــە پەرۆشـــــە
حـــــاڵی بـــــە، مرۆیێکـــــی چ بێکەڵـــــک و نەزانە

بێچـــــارە "ئیمـــــامی" کـــــە گرفتـــــاری خەمســـــت بـــــوو
شـــــێواوی ســـــەری زولفـــــی ڕەشـــــی زۆر و کەمـــــت بـــــوو
قوربـــــانی تەپوتـــــۆزی شـــــەقامی قەدەمـــــت بـــــوو
پەروانەیـــــی ڕوخســـــاری وەکـــــوو تـــــازەشـــــەمت بـــــوو
بۆیـــــە وەکـــــوو پەروانـــــە بـــــە پەروازە شـــــەوانە

**شێخچۆپان، ١٣٣٢ی هەتاوی**

# یارم تەشی دەڕێسێ

زولفــی ڕەشــی لە ســەر ڕوو، وەک نیلــووپەڕ لە ئــاوا
پەخـــش و بـــڵاو و ئـــاڵۆز، لـــوول و دریـــژ و تاتـــا
هاوریشـــمێکی خـــاو بـــوو، بە نـــاز و عیشـــوە بـــای دا
وەک مـــاری زامـــدار بـــوو، هـــاڵا لە بەژن و بـــاڵا
کۆشـــی دەکـــرد بە لادا، یـــارم تەشـــی دەڕێســـێ

کوانێ خوری شـەکی کـاڵ، بکـرم بە ڕۆحـی شـیرین؟!
بیـــدەم بە دەســـتی یـــارم، بایـــدا بە نـــاز و تەمکـــین
شـــی‌کـــاتەوە بە شـــانە، بە قـــامکی نەرم و ڕەنگـــین
بیـــدا ئەویـــش بە نـــووکی تەشـــی جـــوان و نەخشـــین
بـــۆ پـــارچەیەکی پەشـــمین، یـــارم تەشـــی دەڕێســـێ

مەحبـــووبی نـــازدارم، گرتـــی تەشـــی بە دەســـتی
ڕیسی موحەببەت و مەیل خـاو بـوو، بە کـرژی ڕسـتی
گرێـــی دڵان پســـاندی، بە لێـــو و دەســـتی بەســـتی
تـــوولی ئەمەل دریـــژ بـــوو، ســـەنگینی کـــرد و خســـتی
بـــۆی دانەوی بە چوســـتی، یـــارم تەشـــی دەڕێســـێ

لە بـــاغی ســـێو و هەرمـــێ، قەدەم قەدەم بە نەرمـــی
دەچێـتە پـێش لە گـوڵزار بە سـەبرێ، جـوانە شـەرمی
لە باوەشـــی بەپیتـــی، دەگـــرێ دڵان بە گەرمـــی
بولبـــول دەهـــاتە ســـەیری، لە کـــاتی بەزم و ڕەزمـــی
بەو لار و لەنـــجە حەتمـــی، یـــارم تەشـــی دەڕێســـێ

---

بحر مضارع مثمن اخرب: مفعول فاعلاتن// مفعول فاعلاتن

کـــۆڵان و کـــووچەیی دێ، دەڕوا بە نـــاز و عیشـــوە
دەگرێ لە پیر و لە جـوان، ئەو شـۆخە بـاج و ڕیشـوە
جحێـــڵ بە زولفـــی لـــوولی، دەکـــا لغـــاو و ڕەشـــوە
بەو مەکـر و فێـڵ و حـیلە، وەدیـارە مەیلـی بە شـوە
فکرێکـــی بیکـــری کـــردوە، یـــارم تەشـــی دەڕێســـێ

هـــۆنراوەکەی مـــن ئەوچەل، خـــاوێن و بێبنـــووکە
وا ڕیســـەکەی بە دەســـتی مەســـتێکی تـــازەبووکە
ڕازیـــم بە ســـەردڕی وی، دا پێـــی بڵـــێن بە ســـووکە
دەیـــکەم بە چـــۆغە بـــۆ خـــۆم، بیرێســـە هەســـتە زووکە
تـــۆزێ بە نووکەنـــووکە، یـــارم تەشـــی دەڕێســـێ

کـــاکی "ئیمـــامی"! ڕەنـــگە چـــۆغەت هەمـــوو دڕابـــێ
بە شـــێتی ڕیســـی ڕســـتی، مەعلـــووم دەبـــێ پسـابێ
پرســـە لە کـــاکی جـــۆڵا، داخـــۆ لەبـــۆی کرابـــێ؟
دوێنـــێ گـــلەم کە لێکـــرد، ڕەنـــگە دڵـــی شـــکابێ
قەیـنـــاکە، بـــێبەڵا بـــێ، یـــارم تەشـــی دەڕێســـێ

**قاقڵاوا، ١٣٣٥ی هەتاوی**

# بەرخی نێر

نیشتمان! قوربانی کانیاو و زنەی زەنوێرتم
گیانفیدای ڕەشماڵ و شوان و مێگەلی سەر بێرتم
کوشتەیی کارەی مەڕ و بەرخ و بنە و هاوێرتم
عاشقی ئاسکی چیای بژوێن و جوان و تێرتم
گیانەکەم! ئەمنیش بە کارت دێم و بەرخی نێرتم

ڕوح فیدای سروەی بەیانانی عەبیرئامێزەکەت
دڵ بە قوربانی سریوەی تەیرە بێ‌پارێزەکەت
گیانەکەم! ڕۆڵەی ئەتۆ ڕێک چاوەڕێی ئاخێزەکەت
بیگرە باوەش لە هەلدا پێشمەرگەی هێزەکەت
پاسەوانی ناوچەکانی پڕ لە زێو و زێڕتم

هەر لە سەر لووتکەی چیا خەملیوە تا خوارێ بە گوڵ
هەرکەسێکی بەرهەڵستی سەربەخۆییتە بە دڵ
پێی بڵێ وا مەنجەڵی قینی گەلم هاتۆتە کوڵ
ئەی عەجەم! بۆی دەرکەوە، ئەی لنگ‌ڕەشی ڕووت، لاتەقوڵ
خۆ ئەگەر کوردیشە، فەرموو ناهومێدی خێرتم

---

بحر رمل مثمن محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

کـێ بـوو وەک شـێری ژیـان خێـرا لە بێشـەی دەرپەڕی
سـپیەڵاکی دوژمنـی کـوردی بە خەنـجەر هەڵـدڕی
ئـارەقی کـاتی خەبـاتی قەت لە ئەسـتۆ نەسـڕی
نیشـتمان بـانگی دەکـا یـا خـوا بـژی، هەر تـۆ کـوڕی
چـاوەڕێی پڕدانـی تونـدوتۆڵ و هەروەک شـێرتم

هەرکەسێ کورد بێ و "زرنـگ" بـێ، چـاوەنۆڕی هەل دەبـێ
پێشـەوا و خاوەنشـکۆه و قارەمـانی گەل دەبـێ
جێگەیـی شـانازیی و هیـوای هەمـوو کـۆمەڵ دەبـێ
خـاوەنی کانیـاو و چیمەنـزار و بـاغ و گـوڵ دەبـێ
نیشـتمان ئەمنـیش لە باغـتدا ئەوا ئـاودێرتم!

**قاقڵاوا، ١٣٤٢ی هەتاوی**

# ستایشی پێغەمبەر

ئەی خوداوەنـــدی ئاســـمان و زەمـــین!
ســـانعی ڕۆژ و شـــەو، مەهـ و پەرویـــن!
ڕازقـــی مـــار و مـــوور و چـــاک و خـــراپ!
خـــالیقی ســـونبول و گـــوڵ و نەســـرین!
بـــە نەســـیمی بەهـــاری، مڵکـــی خـــۆت
کردووە سەوز و ســوور و کەســک و شــین
بـــۆ منـــیش ئەی خـــودای عەززەوەجەل!
ڕەحمەتـــیێ؛ زۆر فەقیـــرم و مســـکین
خۆ منـیش عەبـدی تـۆ و لـە مـوڵکی تـۆم
موســتەحەققم بــە عەفــوی تــۆ، بە یەقــین
هەرچــی هەم ـ گەرچــی زۆر خراپیشــم ـ
ئەم وتـــە خۆشـــەمە دەڵـــێم ئـــامین

ســـــەد هەزاران تەحیـــــیەت و ســـــەلەوات
بـــۆ محەمـــمەد، شـــەفیعی ڕۆژی نەجـــات

---

بحر خفیف مسدس مخبون محذوف: فاعلاتن مفاعلن فعلن

ئەی (شـــفیع الامـــم!) چ خـــۆش لەقەبی!
چ بەعەزم و ویقـــــار و بـــــائەدەبی!
خـاوەنی عـیلم و حـیلم و عەقـڵ و کەمـاڵ
فەخـری عـورب و عەجەم، چ مـونتەخەبی!
هەڵبژێـــــــــراوی ڕاســـــــپاردانی
خۆشەویســـت و لەپێشـــتران لـــە نەبـــی
تــۆ لــە نەسـلی عەرەب زهـــوورت کــرد
ئاشـــکرا بـــوو فەزیلەتـــی عەرەبـــی
هەرکەســــــێکی کەوا ســــــەناگۆتە
تەڕ و پـــاراوە تەبـــع و زار و لەبـــی
هـــاتیفێ بانـــگ دەکـــا: بنێـــرە بـــە دڵ
تـــۆ کـــە پیـــاوێکی چـــاک و دین‌تەڵەبـــی
ســـــەد هەزاران تەحیـــــیەت و ســـــەلەوات
بـــۆ محەمـــمەد، شـــەفیعی ڕۆژی نەجـــات

ئەی بە نـــووری جەمـــاڵی ڕووی زیبـــات!
پڕ لـە شـەوق و زەوق، لـە سـەر تـا پـات!
یەک لـــە یەک ڕێـــکوپێکترە بەدەنـــت
یەک لـــە یەک بـــۆنی خۆشـــترە ئەعـــزات
ئەی شەهی موڵکی جـوود و خـوانی کەرەم!
"بەرمەکی" شەرمەسـار لـە بەزل و سـەخات
خۆشەویســـــتی خـــــودای عەززەوەجەل
ڕێنمـــا و دەســـت‌گیری ڕۆژی مەمـــات

ئەی شــەفیعی هەمــوو ســەغیر و کەبیــر!
خــاوەنی فەیــز و ڕەحـــمەت و بەرەکــات
قاســـیدێ بانـــگ دەکـــا: بنێـــرە بـــە دڵ
بـــۆ یەکەســـوارە جـــوانەکەی عەرەســـات
ســـــەد هەزاران تەحیـــــیەت و ســـــــەلەوات
بـــــۆ محەمـــــمەد، شـــــەفیعی ڕۆژی نەجـــــات

ئەو شەوی حەو سەمات هەمـوو تەی کـرد
مەڕکەبــی ســـوارەکانی دیـــت پەی کـــرد
چەرخـــی گەردوون هەزار گـــۆنە گەپـــی
بــە ســـکەندەر، بـــە بەزمەکەی کەی کـــرد
چوویـــە جێـــیەک کـــە جـوبرەئیلی ئەمـــین
کەوتـــە لەرزیـــن، گەڕاوە، تـــۆبەی کـــرد
بـــۆ پەزیرایـــی گوڵســـتانی ئیـــرەم
ئەمـری بـۆ هـات و پـاکی خـونچەی کـرد
پیـــــرەداری هەزار ســـــاڵە و کـــــۆن
وەک نەمـــام تـــازە بـــوو، شـــکۆفەی کـــرد
دەنگی ئەحســەن سـەمای هەمـوو کەڕ کـرد
مەلەکێـــک ئەم قســـەی هەبـــوو دەیکـــرد:
ســـــەد هەزاران تەحیـــــیەت و ســـــــەلەوات
بـــــۆ محەمـــــمەد، شـــــەفیعی ڕۆژی نەجـــــات

زەنبیل، ١٣١٣ی هەتاوی

# دڵی مەفتوون

دڵبەری من کە ئینقلابی کرد
کوا خەتای کردووە؟ سەوابی کرد
کە نیقابی لە سەر جەبین لابرد
لە دڵی عاشقان کەبابی کرد
کە بە عیشوە هەڵیبڕی چاوی
گۆشمالێکی ئافتابی کرد
بۆیە قەت نەسرەوت بە ڕۆژ و شەو
لە هەموو کار و خورد و خابی کرد
هەر لە مەشریق هەتاکوو ڕۆژئاوا
تووشی سەد مەخسەرە و عەزابی کرد
قاسیدێ هاتە لام و ئەم قەزیەی
پێ بوو، چابوو بە دڵ خیتابی کرد!
هەر دڵێ موبتەلا وو مەفتوونە
بە سەعادەت هەمیشە مەقروونە

ئەی جەماڵت کەمالی کیشوەری عیشق!
قەد و باڵات بەڕاستی مەسدەری عیشق
خەتوخاڵی جوان و بێ عەیبت
لە سەر و ڕووتە، بۆتە زیوەری عیشق

---

بحر خفیف مسدس مخبون محذوف: فاعلاتن مفاعلن فعلن

ئەی لـە بەحـری سرشـکی دیـدەیی مـن!
یادی ڕووی جوانی تۆیـە گەوهەری عیشـق
بەحسـی حوسـن و جەمـاڵی تـۆ، چـاوم!
نووسـراوە بـە خـوێن لـە دەفـتەری عیشـق
یـادی ڕووی تـۆ دەکەم کەوا دەگـریم
دەڕژێـنم بـە عەینـی جەوهەری عیشـق
دیتـە لام دڵـبەرێ بـە تەنـازی
ئەم قسـەم پێدەڵـێ لـە مەحـزەری عیشـق:
هەر دڵـێ مـوبتەلا وو مەفتـوونە
بـە سـەعادەت هەمیشـە مەقـروونە

خوێنـدی تەیـری دڵـم تەرانەیـی عیشـق
زەمـزەمەی دا بـە داو و دانەیـی عیشـق
هەمهەمێکـی غەریبـی بەرپـا کـرد
لـە دەرویـان و کـونجی لانەیـی عیشـق
بـێپەڕ و بـاڵ و لائوبـالی مـا
وەکـوو مـن هاتـە گوێسـوانەیی عیشـق
وەختەبـوو بەروەبـێ، دڵـم گرتـی
بـردیەوە بـۆ قومارخـانەیی عیشـق
سـەد کەڕەت مـاڵی تەیـری دڵ ئـاوا!
ئەوە مەحـرەم بـە ئاشـیانەیی عیشـق
بانـگ دەکـا زۆر بـە سـۆزی دڵ هەرچەنـد
بێنەسـیبم لـە ئاسـتانەیی عیشـق
هەر دڵـێ مـوبتەلا وو مەفتـوونە
بـە سـەعادەت هەمیشـە مەقـروونە

ئەی خەیاڵـــت هەمیشـــە مەحرەمـــی دڵ!
لێـــوی لەعلـــت نگـــین و خـــاتەمی دڵ!
زیکـــری نێـــوت ئەنـــیس و موونســـی ڕۆح
یـــادی ڕووتـــە ڕەفیـــق و هەمـــدەمی دڵ
تـــاری زولفـــت ئەگەر بە دەس بێـــنم
مووبەمـــوو بـــۆت بەیـــان دەکەم خەمـــی دڵ
تـــۆ دەزانـــی چلۆنـــە ئـــاوی حەیـــات؟!
قەترەیێکـــی کەمـــە لـــە شـــەونەمی دڵ
دەردی عیشـــقی تـــۆ عەینـــی دەرمـــانە
زامـــی دووریتـــە ئەســـڵی مەڵحەمـــی دڵ
دڵـــی مـــن گەرچـــی موبتەلایـــە، بەڵام
ئەم قســـە خۆشـــەیە موســـەللەمی دڵ:

هەر دڵـــێ مـــوبتەلا وو مەفتـــوونە
بـــە ســـەعادەت هەمیشـــە مەقـــروونە

ئەشـکەکەم سـوحبەتی بـە جەیحـوون کـرد
عیشـقەکەم ڕەخنەیـی لـە گەردوون کـرد
لەیلیـــیەک لەم زەمانـــە پەیـــدا بـــوو
عـــالەمێکی بـــە غەمـــزە مەجنـــوون کـــرد
لەف و نەشـرم هەمـوو موشـەووەش بـوو
عیشـقی ئەو هـات و تەبعـی مەوزوون کـرد
بـــە خەمـــی تـــوڕڕەیی پەریشـــانی
دڵـی جەمعێکـی شـێت و مەفتـوون کـرد
عەقرەبـــی ئەگـــریجەی لە بەر حـــوکمی
هەموو عوششـاقی مـات و مەحـزوون کـرد

هـــاتفێ ئەم قســـەی لـــە دڵدا بـــوو
هات و فەرمـووی و ئەمنـی مەمنـوون کـرد:
هەر دڵـــێ مـــوبتەلا وو مەفتـــوونە
بـــە ســـەعادەت هەمیشـــە مەقـــروونە

لەو دەمەی مـــاچی لێـــوی پەیـــدا بـــوو
تـــوتیی تەبعـــی دڵ شـــەکەرخا بـــوو
تـــۆ دەزانـــی "ئیمـــامی"! دڵـــبەری تـــۆ
وەک دەڵـــێن زۆر بـــە ئـــاڵووالا بـــوو؟!
خەیمـــە و بارەگـــای لـــە مـــولکی دڵ
هەڵـــدەدا، بۆیـــە عەقڵـــی شـــەیدا بـــوو
بۆیـــە قەیســـی فەقیـــر و ماڵکـــاول
دڵپەریشـــان و ڕووی لـــە ســـەحرا بـــوو
کـە لـە نێـرگس دەپرسـی، سـەیری دەکـرد
وەک وەنەوشـــە ملـــی شـــکا، چـــا بـــوو
شـــەو لە کـــاتی بەیـــان، دەمـــی ســـەحەری
ئەم حەدیســـە شـــەریفە ئینشـــا بـــوو:
هەر دڵـــێ مـــوبتەلا وو مەفتـــوونە
بـــە ســـەعادەت هەمیشـــە مەقـــروونە

گەردیگلان، ۱۳۱۷ی هەتاوی

# کام خەبات

لەگەڵ یـاری خـۆم بـە جـوانی دەدوێـم
بـە چـرای کوڵمیشـی دەسـووتێم، دەگـرێم

پێـــت بڵــێم چۆنـــە ئەو یـــاری بەرێـــز
خەیـال بـۆ لای دێ، دەکشـێ بـە پـارێز

دڵـــڕفێن، چاومەســـت، بەژن و بـــاڵا بەرز
کەڵەگەت، باریک، جوانچاک، شـۆخ و تەرز

تۆ بـی و خـودای خـۆت، سـەرێک هەڵێنە
بـــە نـــووکی غەمـــزە دڵەکەم دەربێـــنە

بیبـــە بـــۆ لای خـــۆت بیلاوێـــنەوە
لــــە بــــۆتەی عەشـــقا بیتـــاوێنەوە

بزانــە چـی دەوێ پـاش قـاڵبوون دڵـم؟
دڵەکەم مەشـــکێنە، تــۆ خـــواکەی گــوڵم

بەزەیەکـــت بـــێ بـــە حاڵوبـــاڵی
بـــە هـــاوار و داد، بـــە ناڵەنـــاڵی

کـە دەرمـانی کەی بـە پەنـجەی جوانـت
ئـــاخری بەکـــاردێ، دەســـتم دامانـــت

---

بحر متقارب مثمن اثلم (هجایی): فعلن فعولن// فعلن فعولن

فریـــــای نەکەوی، کـــــاری کـــــراوە
جەرگ و دڵـــی بـــاش بـــۆت هەڵقرچـــاوە

تـــا نەچـــووە لە قـــیس ئەو دڵـــە پـــڕ کـــوڵە
تـــــا نەبۆتـــــە چێشـــــت بەو کوڵەکـــــوڵە

لـــــە بـــــۆتەی عەشـــــقا دەربێنـــــەوە
وەکـــــوو پێمکـــــوتی بیلاوێنـــــەوە

بزانـــە چـــی دەویَ پـــاش قـــاڵبوون دڵـــم؟
دڵەکەم مەشـــکێنە، تـــۆ خـــواکەی گـــوڵم

دڵـــی شـــێتوپێت، ســـەرگەردان و وێـــڵ
مانـــدوو، هەڵـــوەدا و دوورکەوتـــوو لـــە خێـــڵ

کێهـــە خێـــڵ؟ خێڵـــی لاوی نیشـــتمان
ئەوەی بـــە پـــاریز دەچـــوون بـــۆ کوێســـتان

کـــام کوێســـتان؟ کێـــوی زەنـــوێری خەبـــات
کـــام خەبـــات؟ ئەوەی گەل دەدا نەجـــات

جێگـــــای بەزەیـــــە ئەو دڵـــــە وێـــــرانە
ئەو شـــــــێتوپێتە، ئەو ســـــــەرگەردانە

لـــــە بـــــۆتەی عەشـــــقا دەربێنـــــەوە
وەکـــــوو پێمگـــــوتی بیلاوێنـــــەوە
بزانـــە چـــی دەویَ پـــاش قـــاڵبوون دڵـــم؟
دڵەکەم مەشـــکێنە، تـــۆ خـــواکەی گـــوڵم

**قاقلاوا، ساڵی ١٣٤٠ی هەتاوی**

# نیشتمانی کورد

ئەو نیشـــتمانی بەرز و بەرێـــز و جـــوانی کـــورد
جـــێگەی ژیـــانی پـــڕ لە هیـــوای پـــاڵەوانی کـــورد

هۆی بەرزیی هەموو گەل و پیر و جەوانـــی کـــورد
بەو ئـــاو و خـــاکە جـــوانەوە بەنـــدە ژیـــانی کـــورد

ئەی خاکی پـڕ لە جەوهەر و هەر لە زێـڕ و زێـو!
هـــۆزت بە شـــاخوداختەوە بـــوونە ســـەربزێو

نیلـــووفەری بـــڵاوی لە ســـەر ئـــاوی بـــێقەرار
ئـــاڵۆز و تـــێکەڵ و بەگـــری، چەشـــنی زولفـــی یـــار

سووچ و کەناری دەشـــتی هەمـــوو ســـەوز و لالەزار
قـــــۆز و لەبەردڵان و لەبـــــارە بەبـــــێ قومـــــار

بەهـــبەه لە شـــاخوداخی ئەو و خـــاک و ئـــاوی ئەو
چەند خۆشە لە سەر زمـان، گەلـی کـوردە نـاوی ئەو

لایەک شـــنەی شـــەماڵە کە دەشـــنێ بە حـــاڵی دڵ
لایەک کـــزەی دڵان لە گـــوڵانە بە ســـۆز و کـــوڵ

لایەک لە خۆشـــی بولبـــولە وا پێکەنیـــوە گـــوڵ
لایێکی دیش کە خونچەیە پێچـرا بە بەرگ و چـڵ

ئەم بەنـــد و ئەم بیســـاتەیە گیـــانە دڵـــی مـــرۆ
دێنێـــتە جـــۆش و دێـــتە خـــورۆش و دەڵـــێ بـــڕۆ

---

بحر مضارع مثمن اخرب مكفوف محذوف: مفعول فاعلات مفاعيل فاعلن

کـــاتی خەبــاتە هـــۆزی بەجێمـــاوی کوردەکـــان
پـــێ هەڵگــرن، درەنـــگە، بـــڕۆن ڕێکـــوو بێوچـــان

هیـــوای گرنگـــی، ئێـــوەیە خـــۆ دایکـــی نیشـــتمان
ئەو نیشـــــتمانی هـــــۆزی گەلـــــی کـــــردە قارەمـــــان

ئەو قارەمـــــانی وا لە خەباتـــــایە ڕۆژ و شــــــەو
ئەو پـــاڵەوانی وا کە بەهێـــــزە و ئەوەنـــــد پـــــتەو

مـــــاوێکی زۆرە مـــــات و ئەســـــیر و قەلەنـــــدەرین
خەمبار و بێکەس و لە هەموو خۆشـــییەک بەریـــن

تا کەی بە پشتی کۆمەوە کۆڵ بـــۆ کـــێ هەڵگـــرین؟
تا کەی بەبێ خەفەت سەرمان نەچتە سەر سەرین؟

بـــا بەس ببیـــنە ئـــالەتی دەســـتان، وەرن! وەرن!
ئەورۆ هەلە، دە هەڵـــپەڕن و دەســـتی یەک گـــرن!

ڕۆیـــی ئەوی کە خـــوێنی مـــژین، ببـــوە پیـــرەزاڵ
ئـــێمە کەلاکـــی کەوتـــوو، ئەو ببـــوە پیـــرەداڵ

خۆراکی جەرگی ئێمە بوو، دەیخوارد قەپاڵ قەپـاڵ
لێی کەوتووە ئەوێســـتە لە بەر زگ وەکـــوو گەمـاڵ

چـــونکی کەلاکـــی خـــواردووە، نـــابزوێ کەوتـــووە
ئابڕوو و حەیای بە جـــارێ لە نێـــو عـــالەمێ چـــووە

سەیری "ئیمامی"ی پیر کە، کە وا کەوتبـوو لە مـاڵ
خەم دایرزانـــدبوو، ســـەری دەبـــزووتەوە بە حـــاڵ

ئەورۆ کەچی لە خۆشـــی، ئەوا کەوتە قیـل و قـاڵ
بانگوو دەکـا و دەڵـی: وەرن، ئەی لاو و کیژوکـاڵ!

دەست دەینە دەستی یەک، لە خیابان و سەرشـەقام
خۆمان بە کوشت بدەین، نەوەکـوو بینەوە غـولام

**قاقلاوا، ۱۳۵۷ی هەتاوی**

## ئەوپەڕی کوردایەتی

دەمێک بە باسی کورد نەکرێتەوە
وتەی خۆشی ئەو نەگێڕیتەوە
سپاسی لاوان بەو نەبڕێتەوە
وەڵامی کوردی پێ نەدرێتەوە

ئەو دەم و لێوە یارەبی ڕەق بێ
پووکی دارزێ، ددانی لەق بێ

چاوێ نەڕێژێ کلی خەمباری
نەژیێنێتەوە کانی بەهاری
فرمێسکی سووری لێ نەبێ جاری
هەڵنەقوڵێ خوێنی دڵی هەژاری

ئەو چاوە یاخوا پڕی کەن لە خوێ
وەنەوز نەدا، ساتێ نەسرەوێ

دەستێ نەنووسێ گۆڤاری مێژوو
نەنووسێ بە خوێن، زەبروزەنگی زوو
نەخاتەوە بیر کاتی ڕابردوو
زۆرداری دوژمن نەخاتەوە ڕوو

ئەو پیلە یاخوا لە بنڕا دەرێ
لە نینۆکیڕا بڕزێ تا سەرێ

---

بحر متقارب مثمن اثلم (هجایی): فعلن فعولن// فعلن فعولن

شانێ هەڵنەگرێ چەکی رزگاری
شان لە شان نەدا زۆر بە وشیاری
کۆڵەپشتی چەک نەبێتە باری
دەنگی تفەنگی نەگاتە شاری

یاخوا جدەو بێ ئەو شان و مله!
یارەبی کۆڵ بێ ئەو دەست و پله

ئەو پێیە نەچێ خێرا بەرەو پێش
بەرەو سەندنی تۆڵەی ئۆف و ئێش
ماندوو نەبێت و هەمووی نەبێ رێش
لە رێی خەباتا نەبێتە دەروێش

با هەر لە کۆتدا بڕزێ ئەو پێیە
بوونی پێی بێکار پووچە، بێجێیە

**قاقلاوا، ساڵی ۱۳۴۲ی هەتاوی**

# ستایشی خودا

(مرغـــان چمـــن به هـــر صـــباحی
خواننـــد تـــو را بـــه اصـــطلاحی)

ئەمنیش وەکـوو وان بـە ئـاە سـەردی
زیکـرت دەکەم و مەدح بـە کـوردی

ئەی خـــالیقی زولجەلالـــی یەکتـــا
وەی ڕازقـــی خەلقـــی بەڕ و دەریـــا!

بـــۆ خـــاتری ئەم بەریبەیـــانە
بـــۆ خـــاتری نـــاڵەیی شـــەوانە

کارم هەموو خـوار و خـێچ و نـاجۆر
زەخمم هەموو کەوتە ئـێش و ناسـۆر

ڕەحمـێ بکـە زوو بـە ئـاهی سـەردم
بینێـــرە خـــودا، دەوایـــی دەردم

لای تـۆ نەبـێ، قاتـە مەرهەمـی دڵ
لوتفـت نەبـێ، ماتـە بەختـی "کامـڵ"

---

بحر هزج مسدس اخرب مقبوض محذوف: مفعول مفاعلن فعولن

بــێ‌هەوری کەرەم چەمەن خەمۆشـــە
بێ‌بارشـــی ئەو، ســـەمەن نەخۆشـــە

حەل نـــاکرێ موشـــکیلی دڵـــی ئەو
پێنـــاکەنێ خـــونچەیی گـــوڵی ئەو

بـۆ خـاتری ئەوکەسـەی کـە نـاردت
بۆ دەعـوەتی چاکـە خـۆت سـپاردت

بێـــدار بکـــە تـــالعی خەواڵـــووم
تیمار بکـە قەلبـی پـیس و مەسـمووم

بەحـری کەرەمـت کـە هاتـە جـونبش
تۆفانـــە، نمێکـــی وەختـــی بەخشـــش

سەد نـووح بـە مەوجـێ سـەرنگوونە
ســەد کەشــتی ئەوی تێیــا زەبــوونە

قەترێکـــی کیفـــایەتی ســـەغیران
جـــورعێکی بەســـە لەبـــۆ کـــەبیران

**قاقڵاوا، ۱۳۴۸ی هەتاوی**

## بۆ خۆشەویستی خوا

ئەی بەدەنـــت پاکــە وەکـــوو ڕۆحـــی پــاک!
ڕۆحــــە ســــەراپا بەدەنـــت؛ ڕۆح فیـــداک!

کێ بوو غەمی ئـوممەتی خـۆی خواردبـوو؟
کۆشـــک و قەڵای کـــافری ڕووخانـــدبوو؟

کێ بوو قوڕەیشـی و مەکەیـی تێکشـکاند؟
داوی لــە ڕێــگەی گەلــی خــۆی هەڵپسـاند؟

کــێ بــوو شــەقی کــرد بــە ئیشـارە قەمەر؟
ســەجدەیی بــۆ کــرد بە دڵوداو شــەجەر؟

کــێ بـــوو لە پــاش ڕێــبەر و پێغەمــبەران
هـــات و بـــووە ڕاهنومـــای ڕەهـــبەران؟

کێ بـوو کـە تەی کردبـوو حەوت ئاسـمان
تـــاکوو گەیشـــتە ســـەفی کەڕڕووبیـــان؟

پەیکـــی ئەمـــین بـــوو لەوێ گرتـــی مەقەر
عەرزی دەکــرد: ڕێــم نییــە خەیرولبەشــەر!

تێــپەڕی لەو جێگــە بــە عەزمــی حــوزوور
گەییــە حــوزوور و بــووە کەیــف و ســروور

---

بحر سریع مسدس مطوی مکشوف: مفتعلن مفتعلن فاعلن

جیــنن و بەشــەر کەوتنــە ڕەقــس و ســەما
یەک لــە عەرز، هێنــدێ لــە ئەوجــی ســەما

تــۆی بە خــودا ئەحــمەدی موختــاری مە
بێ‌تـــۆ بـــە ئـــایەت فەشـــەلە کـــاری مە

ئەی بەدەنــت پاکــە وەکــوو گیــانی پــاک!
ڕۆحـــە ســـەراپا بەدەنـــت، ڕۆح فیـــداک!

زەنبیل، ۱۳۱۲ی هەتاوی

# مەولوودی

بــە دڵێکــی خــاوێن مەولــوودی دەکەم
پــڕ بــە دڵ شــادی و خۆشــنوودی دەکەم

ئەوشـــۆ دوازدەیـــە، شـــەوی وەلادەت
وەلادەتـــی ئەو خەتمـــی ڕەســـالەت

ئەو زاتـــە مـــانگی هەر بـــە ئیشـــارە
لـــە ئاســـمانیڕا کـــرد پارەپـــارە

دوو لەت جـوێ بـۆوە، هاتنـە خـوارەوە
چوونـــە بـــاغەڵی ئەو ســـەردارەوە

هـــاتنەوە دەرێ لـــە هەر دوو قـــۆڵی
بـــە دەســـتوبرد و بـــە تونـــدوتۆڵی

چـــوونەوە ئاســـمان یەکیـــان گـــرتەوە
بـــوونەوە دیســـان بـــە چـــاردە شـــەوە

نـــابێ مـــۆجزەی گەورەتـــر لەوە
یـــانی ڕوونـــاکی و تـــاریکی بەوە

ئەو هاتـــە دونیـــا، تـــاریکی لاچـــوو
چـرا هەڵکـرا، زوڵـمەت بـۆی دەرچـوو

مەلەک لــە فەلەک هاتنــە ســەر زەمــین
بـــۆ پەزیرایـــی مـــوحەممەدئەمین

---

بحر متقارب مثمن اثلم «هجایی»: فعلن فعولن// فعلن فعولن

میــوەی بەهەشــتیان هێنــا بــە دیــاری
بــۆ شــادییانەی مەحبــووبی بــاری

هەیهەی لەو شــەوە، ڕۆژی بــە قوربــان
ســەد مــانگی تابــان هەڵات لــە خۆشیان

لە حەوش و حەسار، لە دەرک و لــە بــان
چەپڵەڕێــزان بــوو، بــوو بــە چراخــان

یــاخوا بەخێــر بێــی شــای بــە تەدارەک!
قەدەمــت بەخێــرا مەنــزڵ مەبــارەک!

گیان با کێشــکچی دەرکــی حەوشــت بــێ
ڕۆحیش بە قوربــان ژێــری کەوشــت بــێ

فەرشـــی حـــاتەمی تـــایی هەڵگیـــرا
دەرگــای ســەخای وی بە جــاریێ بەســرا

قەترێــک لــە دەریــای ســەخای تــۆ بەســە
بــۆ هەر زیرۆحــێ، بــۆ هەرچــی کەســە

شــادی و ســروور و فەخــر و موباهــات
حەســەنات، خێــرات، ئــاوات وەدیهــات

وەک ســەگان کەوتــین لەبەر دەرگــاکەت
چــاوەڕێی لــوقمەی خوانــە یەغمــاکەت

"کامیـــل"! نۆرەتـــە لـــە دەرکوبـــانی
خــۆت بــاش حازرکــە بــۆ پاســەوانی

گەردیگلان،١٣٢٨ی هەتاوی

# خاسەکەو (١)

خاســــــەکەوێ لەو کەژە هەڵنیشــــــتووە
خاڵی ڕەش و سووری بــە جــووت ڕشــتووە

ڕاوچـــــی هەمـــوو لەو کەوە دەرکەوتـــووە
بــۆچی دزە؟ جەردەیــە؟ کێــی کوشــتووە؟

کێهــە کەســی ئەو لــە ژیــان خســتووە؟
مــاڵ و مەڕ و زێــوەری کێــی بــردووە؟

باعیســـی قەتڵـــی چییـــە؟ بیســـتوویەتی
ژینـــی بـــە سەربەســـتییە، ویســـتوویەتی

پــاکی گونــاهی کەوی خۆش‌خەت‌وخــاڵ
ژینـــی بە سەربەســـتە لە نێـــو دڕک‌وداڵ

داوی چەقانـــد تـــاوەکوو ئەو پێـــوەبێ
چاڵکەنــە خــۆی پێــوە دەبــێ، جێ‌بەجــێ

چاکــە کــە داودۆزە شــوکور خاســەکەو
دیویــە، وریایــە، بــە ڕۆژ و بــە شــەو

بــۆچی کەویــش مــافی ژیــانی نییــە؟
حەققـــی کەژ و کێــوی جــوانی نییــە؟

بــۆچی ئەویــش بۆتــە بــرا کوردەکــان
نــابێ هەڵێنـــێ نەفەســـێکی ژیـــان؟

---

بحر سریع مسدس مطوی مکشوف: مفتعلن مفتعلن فاعلن

بێــــتەوە بەردەســــتوو بەبــێ بــــاڵ و پەڕ
پێبکەنـــــێ بیبەنــــــە قەســــــری قەجەر؟

دەک نەفەســوو بگــرێ ئەجەل، جێبەجــێ
وا کــە نەتــانبێ قەوەتــی دەســت و پــێ

خـــــــاوەنی ئەو کێـــــــو و کەژە هەر کەوە
نەزم و نیزامـــــــی کەژ و کێـــــو هەر بەوە

لێــی‌گەڕێ بــا بــاڵ و پەڕی جــوان بکــا
لەو کەلـــــە بـــا بـــانگی ڕەفیقـــان بکـــا

بێـــنەوە کانیـــاوێ، بخـــۆن ئـــاوی ســـاف
بـــۆ گـــورەیی ســـەربنە بێنـــە مەســـاف

لێــی‌گەڕێ دەنــدووکی بــە بەرد تیــژ بکــا
گـــوڕڕە بکــا و بــانگی کــوڕ و کیــژ بکــا

کــوڕ بــە گورەگــوڕ وەکــوو شــێر و پڵنــگ
کــچ بــە شنەشـــن بـــە خرینگەخرنــگ

بــێن و بڵــێن: خــاوەنی کێــوان ئەمەیــن
سوورە دەنووکمان، بە دەنووک شەڕ دەکەین

خـــاوەنی ئەم خاســـەکەوەش هەر دەڵـــێ:
ڕاوچــــی دەبــێ لەم کەژ و کێــوە هەڵــێ[1]

قاقڵاوا، ١٣٤٢ی هەتاوی

---

[1] بەیتی کۆتایی بەم شێوەیەش نووسراوە:

خاوەنی ئەو خاسەکەوەش هەر دەڵێ: ئێمە موقیمین، بڵێ دوژمن هەڵێ

# خاسەکەو (٢)

خاســـــــەکەوێ لە بەنـــــــدەنێ
دیـــــتم خۆشخـــــۆش پێـــــدەکەنێ

بە کـــێ، بە چـــی، بە مـــن و بە تـــۆ
بە ژینـــــی وا بـــــێ تـــــار و پـــــۆ

دەیگـــــوت ئێـــــوە لە گەرمێـــــنن
لە کوێســـــتانڕا بـــــۆو دەخـــــوێنن

لام وایە مـــــن، بە بیـــــر و ڕام
گەرمـــــێن و کوێســـــتانێ گەڕام

نەمـــــدی کەس تەنیـــــا ســـــەرکەوێ
یـــــا بە دڵێکـــــی خـــــۆش وەرکەوێ

هەرکەس بە تەنیـــــا مـــــایەوە
داویـــــان لە ڕێگـــــا نـــــایەوە

بە دەنـــــدووک پێـــــوە بـــــوو وەک کەو
ڕۆژی ڕوونـــــاکی بـــــوو بە شـــــەو

گـــــوێ لە ئامۆژگـــــاریم بگـــــرن
نەک بـــــکەونە داوێ بمـــــرن

---

بحر رجز مربع مطوی مخبون: مفتعلن مفاعلن

یەکێ لێرە، یەکێ لەوێ
یەک کەونەوە، لە منوو کەوێ

بەس بەشبەش و لێک پساو بن
بەس بێبیر و بەشخوراو بن

دەستێک تەنیا دەنگی نایە
مناڵێک بۆی ناکرێ کایە

بە دوو دەست چەپڵە لێ دەدرێ
بە دوو مناڵ گەمە دەکرێ

ئەو نیشتمانە پیرۆزە
هەموو کاتێکی نەورۆزە

شەوی ڕۆژە، ڕۆژی نەورۆز
جێی شانازی زۆرە بۆ هۆز

وەک بەهەشت خەملیوە بە گوڵ
نەک دڵێک، بەڵکە هەزار دڵ

ئاوبردەی ئاو و خاکییە
گیرۆدەی خاکی پاکییە

بەڵام بە داخەوە هەروا
لە ژێر دەستی داگیرکەردا

وێرانە و لاڕووخاوە
ڕێک چاڵ و چۆڵە و کەلاوە

شەوی مەینەت، ڕۆژی شەوە
بۆ گەل و هۆز و نەتەوە

هیـــوا و ئـــاوات و تاســـەیە
ئـــاخ و داخ و هەناســـەیە

دەســـت بە چـــاوی خەوا بێـــنن
ڕابـــن، دوژمـــن داپەڕێـــنن

کـــاتی ڕاپەڕیـــنە، هەســـتن
دەســـت و پێـــی بەرهەڵســـت بەســـتن

بـــا بەس بەســـتن دەســـت و پێتـــان
بـــا بەس بگـــرن لێتـــان ڕێتـــان

لێک بن، ڕێک بن، دەست بە دەست دەن
شـــایی بە خـــۆ و حەز لە هەســـت کەن

گەر هەســـت و قەســـت و مەبەســـتتان
ڕێـــک بەخـــتکەن بـــۆ کوردســـتان

ئەوجـــار دەژیـــن بە سەربەســـتی
ســـەردەکەون بە تەڕدەســـتی

لە ســـارای بەرزی ئـــازادی
دەکەونە خۆشـــیی و شـــادی

**قاقڵاوا، ١٣٤٥ی هەتاوی**

# خوشک و براین

ئەی دوژمنــــی گەلــی کـــوردا!
هەڵـــێن زوو بە دەســــتوبرد

پێشـــــمەرگەن لە کێشـــــکێیە
تفەنگــــی لە ســــەر پێـــیە

هەر وینـــیکەون دەردەچـــێ
دەوکـــووژێ زوو جێبەجـــێ

کەلاکـــوو جـــێ دەمێنـــێ
کونـــد لە جێگـــاو دەخـــوێنێ

تـــا تێبگـــرن مەڵبەنـــدیان
دەپـــارێزن کـــورد بە گیـــان

وچـــان نـــادەین، ناســـرەوین
وەک تەمومـــــژ نـــــاڕەوین

ئێـــوە تـــۆزن، بە بـــایەک
هەریەک دەڕۆن بـــــۆ لایەک

ئـــێمە لە کێـــوان دەژیـــن
بە هیـــواین خوێنـــوو بمـــژین

---

بحر مضارع مربع اخرب: مفعول فاعلاتن

ئەوجـــار بە دڵێکـــی بـــێخەم
بە بیـــروڕای زۆر مەحـــکەم

دەپـــارێزین نیشـــتمان
نیشـــتمانی بەهەشـــتمان

کیـــژۆڵەی ڕێکـــی حـــۆرین
بە شـــەرتێ دڵ نەگـــۆڕین

هەمـــوو دایـــک و خوشـــکمانن
کیـــژ و کـــوڕ هاوپشـــتمانن

خوشـــک و بـــرای هاوپشـــتن
جێگـــای شـــانازی گشـــتن

**قاقلاوا، ١٣٤٢ی هەتاوی**

# شنەی بەهار

بەهـــارە و شـــنەی مـــایەی ژیـــانە
بـــە شـــنەی ژیـــاوە ئەم نیشـــتمانە

بەهـــار هێـــنەری مـــوژدەی خەبـــاتە
لابەری مەیـــنەت، هێـــنەری هـــاتە

ئـــاوری نەورۆزی پڕشـــنگی ژیـــنە
بـــۆ گەل و بـــۆ هـــۆز گـــڕی بەتیـــنە

گـــڕ و گـــڕپەی ئەو ژینـــی پێـــوەیە
بریســـکەی خەبـــات هەر لەوێـــوەیە

ئـــاگری نەورۆزە یـــا تیشـــکی هیـــوا
ڕوونـــاککەرەوەی تـــاریکی هەوا

گڕپەی خـورپەی دڵ، شـەوقی زەوقـی گەل
لـــە دەوری داڵـــێن لاوان بـــە کـــۆمەڵ

کـــاتێکی خۆشـــە، فەســـڵی نەوبەهـــار
دووری لـــە نەیـــار، نزیکـــی لـــە یـــار

ئەوە ســـەوز ئەکـــا تـــۆوی ڕزگـــاری
بەرهەم دێنـــێ بـــاغ بـــۆ کـــوردەواری

هێنـــدێ دەرزێنـــێ، هێنـــدێ دەڕوێنـــێ
بەو گەرم و ســـاردی لـــە خـــۆی دەنـــوێنێ

---

بحر متقارب مثمن اثلم (هجایی): فعلن فعولن// فعلن فعولن

دووبەرەکی گەل دەڕزێنێ سەرپاک
تۆوی یەکیەتی دەڕوێنێ لە خاک

بەهار بەخێرێ، دنیا گرتی ڕەنگ
ڕۆژی وەدەرخست لایبرد شەوەزەنگ

بە تەپڵ و تۆپ و بە زەبروزەنگە
دەی، سا، نەتەوەی کاوە! درەنگە

بۆ پێشواز پاکوو برازێنەوە
شنە! تۆش کۆرپە بلاوێنەوە

لە بێشکەی خەما ڕایژێنە تاوێ
بۆی دەرخە کاتێ، هەتاوێ، ساوێ

ببووژێتەوە لە بەر تاو و ساو
تا بێتە جێگەی شانازی تەواو

فتیلەی ڕێگەی ڕزگاری پێیە
بەخێو کردنی یەکجار بەجێیە

با بێتە بەرهەم کۆرپەی نەتەوە
هیوای دواڕۆژی نەتەوە بەوە

بۆ نیشتمان و بۆ گەل دەکۆشێ
لە ڕێی وان سەد چەل زووخاو دەنۆشێ

ئەوسا ئاواتی "ئاوات" دیتە جێ
شین دەبێ خەڵفی هیوای جێبەجێ

**قاقڵاوا، ١٣٤٣ی هەتاوی**

# لە بەرچاوان دەکەوم

وردەوردە لە بەر دڵ و چـــــــاوان
دەکەوم، وا دیـــــارە بێ‌تـــــاوان

ســووچ و تـاوانی مـن هەمـوو مـاڵە
نیمــە بیــدەم بە کەس، دەنـا خـاڵە!

هەرچــی پێویســتی پیــاوی وشــیارە
لای منــی چــارەڕەش بــە خەڵــوارە

شــەرتە ئەوچەل لەوانــە خــۆ وەدزم
ئەگــە زانــی ئەزم، دەنـا خــۆ دزم

خــواروخێچی و دزی و درۆ کــردن
بـێ نەخۆشـی بـە سـەکتە زوو مـردن

مــۆدی ئەمڕۆیــە، ڕێــزی لێ‌بگــرە
عەیب‌وعاریش لە هیچ کەسـێ مەگـرە

ئەوی ڕۆژباشــی کــردی، ڕۆژی بــاش
ئەوی نەیکرد، شتێکی سووری بە پاش

---

بحر خفیف مسدس مخبون محذوف: فاعلاتن مفاعل فعلن

کەس بــە هــاواری تــۆ ئەگەر نــایە
تــۆش لەگەڵ ئەو کەســە مەکــە کــایە

ئەو کەســێکیش کــە دێ بــە هــاوارت
بۆتە دۆست و ڕەفیـق و خەمخـوارت

خـۆت بە قوربـانی وی بـکەی چاکـە
بــە ئیشـــــارێکی ئەو هەڵـــێ، ڕاکە

ڕامەوەســـتە، بـــڵا ملـــت بشـــکێ
نەکــوو ڕاوەســتی، ئــابڕووت بتکــێ

پێت بڵێن هیچوپووچە، کــاتی خەبـات
ڕادەوەســـتێ، هەتــا دەبــێ دەرفــات

چاکــە گەر پێـــت بڵـێن لــە مەیــدانا
هات و نەبـزووت هەتـا ســەری دانــا

ئافەرینـــت بـــکەن، نەوەک نەفـــرین
ژیــن نییــە بــایەخی، هەمــوو دەمــرین

قاقڵاوا، ۱۳۵۰ی هەتاوی

# شین بۆ خەمین

ڕۆیـــی ئەو بولبـــولی بـــاغی مەلەکـــووت
عـــالم و هـــۆنەر و عـــارف بە ســـبووت

فـــرە کێشـــاوییە مەیـــنەت بـــۆ کـــورد
قەت هەدادانـــی نەبـــوو تـــاکوو مـــرد

ئەی دەمـــم بشـــکێ، کـــوتم مـــرد؟! مـــاوە
خەوتـــــــووە، تـــــــۆزێ وەنەوزی داوە

هەربینـــــا ڕابـــــێ لە خەو دووبـــــارە
تێبکۆشـــــــێتەوە بـــــــۆ ئەو کـــــــارە

یـــانی هەر بـــۆ گەلـــی خـــۆی تێکۆشـــێ
کەموکـــــــوورِی گەلەکەی داپۆشـــــــێ

نـــامرێ پیـــاوی خـــودالێخۆش بـــوو
زاهیـــری ڕۆیـــی، لـــە پـــێش چـــاوان چـــوو

"شـــێخ عەلـــی" کاکـــە، "خەمـــین"ی شـــۆرەت
تەمەنـــــی کەم بـــــوو، بەڵام بێ‌مـــــۆڵەت

ئەجەلـــی هـــات و گـــوڵی عـــومری ڕفانـــد
عـــالەمێکی بـــە غەم و غوســـە مرانـــد

---

بحر رمل مسدس مخبون محذوف: فعلاتن فعلاتن فعلن

خــــاوەنی ســـفرە و خـــوان بـــوو، ڕۆیـــی
هـــــاودەمی پیـــر و جەوان بـــوو، ڕۆیـــی

ڕەونەقــــی هۆنەرەکـــــان هەر ئەو بـــوو
خۆشـــــی ئـــــاواتی دڵان هەر ئەو بـــوو

ئێســـــتە "ئـــــاوات" بە تەنــــێ مــــاوەتەوە
نەتەوی، داوی لە ڕێـــــــــی نــــــــاوەتەوە

هەربینــــا پێوەبــــوو ئەو بــــێچــــارە
هاتــە خــزمەت تــۆ "عەلــی" گیــان! دیــارە

چ بکـــــا؟ نـــــازی بەبـــێ تـــۆ تـــازە
دوور لـــە تـــۆ کەوتـــووە، زۆر بێنـــازە

ژینی چی، شـاعیری چـی، هـاودەمی چـی؟
عــومر ئەگەر مـابێ لـە زۆر و کەمـی چـی؟

هۆنەرێــک بــووم و لــە شــێعرا زاڵ بــووم
بــێ تــۆ مــات و لــە زمــانم لاڵ بــووم

تــۆ منیشــت وەکــوو خــۆ بــێدەنــگ کــرد
بێوتـــە و بێهـــونەر و بێڕەنـــگ کـــرد

لێـــرەدا دوایـــی دەهێـــنم بـــە وتـــار
کــوا وتــارم هەیــە؟ کــوا ســەبر و قەرار؟

## وەک مەسنەوی

ببیـــە لەو قامیشـــە، چۆنـــت پـێ دەڵـێ
پێت دەڵـێ خێـرا بـە سـۆزی مـن هەڵـێ

سـۆزی مـــن، سـۆزی دڵێکـە ئـاگرین
ئاگرێکـە زۆر بەتـین، پشـکۆی ئەویـن

هەر پریشـــکێکی دەبرژێنـــێ دڵێـــک
هەر بڵێســێکی دەپشـــکوێنێ گوڵێـــک

بەندبەنــدە نێــو دەروونــی پــڕ زووخــاو
وشــک و ڕەق، ئەنــدامی دڵ تێـدا نەمــاو

دڵ لەوێ ڕۆیـــی بـــە یـــادی دڵـــبەری
دڵبەرێکـــی شـــۆخوشـــەنگی وەک پەری

هەرکەســـێ دەردی ئەوینـــی چەشـــتووە
شـــەربەتی مەرگـــی بـــە لێـوان مشـــتووە

هەر بـــە ئـــاخ و داخەوە دەتلێـــتەوە
شـێت و پەتیـارە لــە کێـو دەخـولێتەوە

---

بحر رمل مسدس محذوف: فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

هەروەکـــوو مەجنـــوونی ماڵوێرانـــە ئەو
ڕۆژ و شـــەو بێچـــارە، ســـەرگەردانە ئەو

هەرکـــە بیســـتی دەنگـــی بلـــوێری شـــوان
بەســـتی خێـــرایەک کەمەر بـــۆ ڕێـــی نەمـــان

ڕێگە چی؟ پـــڕ دڕکوداڵ و بەرد و چێـــو
هەر سەرەوژوور و سەرەوژێر، شاخ و کێو

چاڵ و چۆڵ و پڕ مەترسی و موشـــکیلات
لابەلا و هەڵـــدێر و ڕێـــی هـــات و نەهـــات

تـــۆ "ئیمـــامی"! چاکـــە هەر بخـــولێیەوە
هەروەکـــوو شـــەم هەڵبیـــی و بتـــوێیەوە

**قاقلاوا، ١٣٤٥ی هەتاوی**

# هات و نەهات

بـــانگی خزمـــان و هـــاوالآن دەکەم
هـــات و نەهـــاتی خـــۆم بەیـــان دەکەم

پســـام، هێنـــد گەڕام هەر لێـــر و لەوێ
جـــارێکی بـــە ڕۆژ، کـــاتێ بـــە شـــەوێ

داخـــۆ دۆعـــای کـێ لـــە مـن کـاری کـرد؟
خێڵـی هەل و هـات لای مـن بـاری کـرد

لەم مـــاوەی ژینـــە کـــە مـــن ڕامبـــوارد
هەر خـۆم بـە کـاتی هەل و هـات سپارد

کەچـــی هەر نەمـــدی کـــاتێ هەل دەهـــات
هەرکـــاتێ هەل هـــات، هـــاتم بـــۆ نەهـــات

ســـەد خەرمـــان گەڕام بـــە دەســـتی خـــاڵی
ســـەد ئاشـــم لێکـــرد، هـــیچم نەمـــاڵی

هێشـــتا جەواڵـــم بـــێ گەنـــم و ئـــاردە
تەنـــووری دڵـــم هێشـــتا هەر ســـاردە

ئـــاخ دەمـــدی دەمێـــک تەنـــدووری گەرم
نـــانێکم دەخـــوارد بێتـــرس و شـــەرم

---

بحر متقارب مثمن اثلم (هجایی): فعلن فعولن// فعلن فعولن

نـــازانم چەرخـــی زەمـــان هەر بـــۆ مـــن
نەمـــامی ژینـــی کـــردم ســـەرەوبن؟

یـــا کـــار و پیشـــەی ئەو چەرخـــە کـــۆنە
هەر وایـــە؟ چـــونکی وشـــک و بـــێڕۆنە!

بە ڕۆن چەور ئەبـێ یـا بـە خـوێنی گەل؟
ئەو خوێنەش کەنگێ؟ ڕۆژی خۆشی هەل!

یـــاخۆ وەک کـــوتم هەلـــم بـــۆ نـــایە
بۆیـــە گەل بـــۆ هەل هەر هەڵـــوەدایە

بەڵام قەیناکـــــا، مـــــافی خومـــــانە
ئەم دەرکـــــاودەرک و ئەم بانەوبـــــانە

لـــە هـــیچ لایێکـــی "ئـــاوات" پێکنـــایە
دڵ هەر نەســـرەوت لـــە هـــیچ جێگـــایە

قاقڵاوا، ١٣٤٨ی هەتاوی

## ڕۆژی هەستان

ڕۆژی هەســــتان و ڕاپەڕیـــــنە وەرن!
مـــافی خۆتـــان بە کـــوردی وەربگـــرن

ئێســــــتە شـــــاییم ئەوا لە دڵ دەگەڕێ
بە بـــرا کوردەکـــانی خـــوار و ســـەرێ

گیـــانی خۆیـــان بەخـــت دەکەن بەپەلە
بانـــگ دەکەن وەرنە پێشـــێ، ڕۆژی هەلە

خـــاڵە! کێـــوی بلنـــدی ڕزگـــاری
بـــۆت بەیـــان کەم بە کـــوردی ئاســـاری

ســـەخت و هەڵـــدێر و نالەبـــار و چـــڕە
پـــڕ لە هەوراز و چـــاڵ و چـــۆڵ و خـــڕە

کـــوردە گیـــان! ســـەرکەوە بە چنگەکـــڕە
ســـەربەخۆیی بە خـــوێنی خـــۆت بکـــڕە

تـــوێخی دەســـتت بـــلا هەمـــوو لاچـــێ
شـــانەبەرد بـــا نینۆکـــت هەڵپـــاچێ

ئەوکەڕەت نێـــوی تـــۆ لە مەیـــدانە
پێـــت دەڵـــێن قارەمـــانی تەنگـــانە

تەمەنـــی مـــن لە ســـاڵی ســـیودوو بـــوو
ئـــاگری ســـەربەخۆیی گەل هەڵبـــوو

---

بحر خفیف مسدس مخبون محذوف: فاعلاتن مفاعلن فعلن

نەکـــوژاوە گەیشـــتە حەفتـــا ســـاڵ
تەمەنـــم ئەی عەزیـــزی کیـــژ و کـــاڵ!

ئێســـــــتەکەش وا دەزانـــــــم هەر لاوم
هەر لە ســـەر بیـــر و بـــاوەڕم مـــاوم

یـــا بە ئـــاواتی خـــۆمەوە دەمـــرم
یـــانە ئـــاوات لە باوەشـــم دەگـــرم

وا مەزانـــــن مرۆیەکـــــی ســـــادەم
بـــۆ شەڕوشـــووڕ هەمیشـــە ئامـــادەم

مـــن لە ژێـــر چـــاوەدێری پیاوێـــکدا
پێگەیشـــــتووم، دەبـــــێ بـــــڕۆم هەروا

پێـــی دەفەرمـــووم: مەترســـە بـــۆ پێشـــێ
چەکـــی دوژمـــن برینـــی نایێشـــێ

نـــابڕێ تیغـــی کـــۆڵی دوژمنـــی گەل
قەت مەترســـە و مەدە لە دەس خـــۆ هەل

ئێســـــتە هەڵکەوتـــــووە، دەڕۆم بە پەلە
دەیـــکەمە گـــۆمی خـــوێن و دێـــمە مەلە

نـــابێ ترســـم هەبـــێ لە کوشـــتنی خـــۆم
هەر بە ڕێـــــــگەی ئەوا دەڕۆم و دەڕۆم

"کامیـــل"م مـــن لە ڕێـــی خەبـــاتی کـــورد
گیانی خۆم بەخـــت ئەکەم بە دەســـتوبرد

**قاقلاوا، ١٣٥٢ی هەتاوی**

# وەڵامی حەقیقی

قاسید پەیامی دڵبەری دا، دڵ نەما خەمی
بەهەبەهـ چ قاسیدێکی مەسیحادەمە، دەمی

"تاهیر" کە نووری دیدەیی تۆو سەروەری منە
بۆ چاوی من میسالی کلە، خاکی مەقدەمی

مەنزوومەکەی گەیاند و برینم کولایەوە
ئاخر بە فکری چارە بە، لای تۆیە مەرهەمی

فەرمووتە بۆ نەهاتی، نەهاتی منە مەگەر؟
قوربان زەمانە هات و نەهاتە هەموو دەمی

کوا دێتەجێ لە زیندەگییا ئارەزووی دڵ؟
چونکە هەزار ساڵە دەڵێن موددەتی کەمی

حاشا لە شایەتی کە گەدا بم لە دەرکی تۆ
نایدەم بە مڵک و ماڵی جیهان، عومری ئەدهەمی

"کامیل" دەمێ لە یادی "حەقیقی" هەتا هەیە
ناچێتە دەر، هەمیشە لە بەرچاو و سەر دەمی

# نامەی ئاوات بۆ حەقیقی (٥)

ئەوا بـاکەی شـەماڵ هێنـای لـە خـزمەت یـارەکەم کـاغەز
بەخێـر بـێ ڕۆحـی شـیرینم گـوڵی بێخـارەکەم کـاغەز

بە قوربـانی وەفـات بـم چـاوەکەم، مەمنـوونی ئەلتـافم
کـە لێـت پرسـیم و نـاردت بـۆ دڵەی ئـاوارەکەم کـاغەز

هەمـوو لەتلەت ببـوو بەنـدی دڵـم بێلـوتفەکەی یـارم
دەوای کـرد نـاردی بـۆ "کـانیبەن"ی دڵـدارەکەم کـاغەز

لەبەر ڕۆژوو نییـە، بێهێـزی تـۆم و دەردەداری تـۆ
هەنـاوم هاتـە بەر، بوویـە دەوای ئـازارەکەم کـاغەز

لـە بۆکـانێ کـە کـانی گەورەکانـە تـۆش لەوێـی بـۆیە
سەرم بەرز و بڵیند بوو هات لەجێی "سـەردار"ەکەم کـاغەز

"حەقیقی" تـۆش حەقـیقەت سـەربڵیند و بەرز و مـاقووڵی!
کە کردتە پەیکی ڕەحـمەت بـۆ دڵەی خەمبـارەکەم کـاغەز

ئەگەر دوورە "ئیمـامی" گوفتوگـۆی بۆنـاکرێ جـا چـش
نییـە فەرقـی نزیـک و دوور لەجێـی گوفتـارەکەم کـاغەز

**کانیبەن، ١٣٣١ی هەتاوی**

# وەڵامی حەقیقی

"ئیمـــامی"! نـــامەکەی نـــامی گەیشـــت و نامـــە ســـەرچاوم
لـــە دووری تـــۆ دەبـــاری دایبمـــا فرمێســـکی خوێنـــاوم

بەبـێ مـــانگی موبـــارەک لـێم حەرامـــە چـاوەکەم بـێ تـۆ
پڵاو و گۆشت و دۆڵمە و مەشـکەفی و فرنـی و هەلیمـاوم

لەبەر ڕۆژوو نییـــە، دووری لـــە دینـــی تۆیـــە گەر مـــردووم
ئەجەل دەورم دەدات، هیـــوای ویســـالی تۆیـــە گەر مـــاوم

ڕەفیقانـــت لـــە هیجرانـــت بەجـــارێکی هەمـــوو ســـووتان
بـــە نـــاری عیشـــقی پـــاکی تـــۆ، بـــە تەنیـــا مـــن نەســـووتاوم

کـــە فەرمووتـــە: فیـــداتان بـــم، وەرن ڕۆژی هـــیلاکەتمە
چ حـــاجەت هـــاتوچـــۆ بەینـــی مـــن و تـــۆ، بۆیـــە دامـــاوم

لـــە قـــوللەی قەلبـــی یـــاران خەیمەیـــی نـــازت وەهـــا هەڵـــدا
لـــە خـــانەخوێ و لـــە میـــوان، غەیـــری تـــۆ نایێتـــە بەرچـــاوم

لـــە ڕێگـــای عەشـــقی تـــۆدا ڕەهرەوانـــت هیچـــی ناوەســـتن
هەموویان "کامیـــل"ن وەک تـــۆن و هەر مـــن ســـەر لەپێنـــاوم

ئەگەر وابـێ ئەوەی دۆسـتی "حەقیقـی" بـێ لەبیـر نـاچێ
بـــە قەولـــی "کـــاعەزیز": بێـــت و نەیـــە، پـێڵاوی ســـەرچاوم

## نامەی حەقیقی بۆ "ئاوات" (٦)

دەمێکـــــە دڵ لـــــە دووریـــــت ئـــــاگرینە
خەمـــــی هیجـــــرت گرێکـــــی زۆر بەتیـــــنە

دەمێکـــــە دڵ بـــــە ئاواتـــــت "ئیمـــــامی"
خەفەتبـــــار و برینـــــداری ئەویـــــنە

ژیـــــان، بـــــاوەڕ کە لای مـــــن ژانـــــە بێتـــــۆ
ژیـــــانی وا بەژان کەی نێـــــوی ژیـــــنە؟

ئەوا ڕۆژی تەمەنمـــــان گەییـــــە ئاســـــۆ
دەمـــــی پـــــاڕانەوە و تۆبـــــە و گـــــرینە

# نامەی سەیید بۆ غالیب* و ئاوات(۱)

"غالیب" و "ئـاوات" دوو شـەم بـوون و دڵـم پەروانەیەک
هەردەمــە دوو جــار دەســووتام مــن بەبــێ پەروانەیەک

جــــارێ ئەو دەیبــــرد دڵــــم ئەو جــــارێ دەیهێنــــایەوە
دوو تەنــاف بــوو بــۆ دڵــی تەنیــام کــە کردبوویانــە یەک

دەســـت و پێــی دڵ بەســـتراوە، تــابی زنجیــری نیــیە
تاقــە هەودایەک بەســە بــۆ دەســت و پێــی دێــوانەیەک

بۆیــە دوو ســاقی بــە دوو جــام دێنــە ســەر ئاسـۆی دڵــم
دیــارە بــۆ مەســتێک کەمــە یەک ســاقی و مەیخــانەیەک

ڕەمزی عەشــقە وا بــە دوو ســەیاد بە دووی ســەیدێکەوەن
گەر نــــە تەیــــری دڵ ئەســــیر نــــابێ بــــە داو و دانەیەک

من لەگەڵ خــۆم و خــودای خــۆم عەهــد و پەیمــانم هەیە
بچمــــە ســــەر کەوســــەر بەبــێ‌وان نــامەوێ پەیمــانەیەک

"غالیــــب" و "ئــاوات" دوو جانــانەی مــنن، دڵ پێمدەڵــێ:
تــۆش دوو جــار بمــرە "ســەید"! هەرجــارە بــۆ جانــانەیەک

---

* حاجی سەید محەممەدی نوورانی، شێخی زەنبیل

# نامەی سەیید بۆ ئاوات (٢)

وەرنە سەر سەرچاوەکەی چاوم کە سەیرانی هەیە
ڕوون و لێلە جاربەجارە حالّی سیروانی هەیە

گەرچی باریکە مژۆڵ بۆ بەردەبازی ڕێگەتان
کۆلکەداری ئاوەسووی من تاقەت و توانی هەیە

ماڵەکەم کۆن و بچووکە لایەقی ئێوەش نەبێ
ماڵی دڵ ئاوا هەراوە، جێی هەمووتانی هەیە

گەرچی وێرانە وەکوو "جەمیان" دڵم ئاو و هەوای
زۆر لەتیفە وەک قەریحەم تەبعی جەمیانی هەیە

گەر تراکتۆرێک هەبێ مەزرای دڵی من شێو بکا
لەم چیا سەرسەوزەدا مەودا وو مەیدانی هەیە

شین دەبێ تۆوی مراد ئاخر لە مەزرای ئارەزوو
ئاسمان ئەمڕۆکە مەیلی تاوەبارانی هەیە

"سەیید" ئەمڕۆ ئیمتیحانی شانس و بەختی خۆی دەکا
تا بزانێ کاکە "کامیل" لوتفی جارانی هەیە؟

# وەڵامی ئاوات بۆ سەیید

هـۆنەرێکی پیـری وەک مـن، کـوا وتەی جـوانی هەیە؟
کــوا گــوڕ و تــین و توانــای جاریجــارانی هەیە؟

گوێم خەریکە گـوێ نەداتـە بەنـد و بـاو، چـاویش ئەوا
کەمکەمــە بێنــوور دەبێــت و حــاڵی بــوحرانی هەیە

هەرکــە بیســتم مــاڵەکەت هــاتۆتەوە جەمیــان، کــوتم:
ســەد شــوکر وا هەوری ڕەحــمەت مەیلـی بـارانی هەیە

هــاتیەوە بــۆ خانەقــای پیــرۆزی بــابی گەورەمــان
ئــاوەدان بــێ زۆر هەراوە جێــی هەمووـمــانی هەیــە

گەرچی هەروەک مۆتەکە سەر سینگی گـرتم پیـاوەکەت
ڕۆژوەوان بۆخــۆت دەزانــی ڕۆژ و شــەو ژانــی هەیە

خۆ بەڵام چونکـە لەلایەن تـۆوە بـوو، پێـی سـەر سـەرە
ڕۆژوەوانــیش کــاتی ئێوارانــە دەرمــانی هەیــە

تێروپــڕ دەخــوا، هەتــا تێرتێــر نەبــێ ناکشــێتەوە
جرتوفرتــی لــێ پەیـا بــێ، جــا وچــاندانی هەیە

بـۆ تراکتـۆر نـاردبووت "سـەیید"! ئەوا پێشـکەش کـرا
پیـاوەکەت دەیگـوت کـە ڕۆژێـک کـاری کێڵانـی هەیە

گیانــە "ئــاوات" برســییە و بێهێـز، دەنـا بـۆ خزمەتـت
حــازرە بــێ، چــاو دەگێــڕێ داخــۆ کــێ نــانی هەیە

## وەڵامی سەیید بۆ ئاوات (٣)

ئەی مەنبەعــی فەیــز و جــوود! ئەی شــاعیری پڕمــایە!
تــــۆ مەرکەزی ئیحســــانی، تــــۆ کــــانی کەمــــاڵاتی

مــن بەنــدەیی تــۆم قوربــان! تــۆ ســەروەر و ســەرداری
شایســــتەیی تەعزیمــــی، جێــــی فەخــــر و موباهــــاتی

ئەســتێرەیی شــەوتابی، هــاتم بــە هومێــدی ڕووت
تا شــەو کــە مــوعەتتەل بــووم، مــن ڕۆیــیم و تــۆ هــاتی

# وەڵامی ئاوات بۆ سەیید

"قادر" بەخودا ئەلحەق ئوستادی بەیاناتی!
تۆ مەزهەری هەڵبەست و ئەشعار و مەقالاتی

ئەمڕۆ نییە هەر بێشک هەمڕەنگ و هەمئاوەردت
قائانی بڵێی ئەمڕۆ بێمۆدە غەزەلیاتی

"فێردەوسی" و "قائانی" ناگەن بە غوباری مە
من پەستی خەیاڵاتم تۆ مەستی کەماڵاتی

با باسی نەکەین باشە چون من بە مەسەل زیاتر
دەرکەوتووە لێم پیری، ئوفتادەگیی و لاتی

فەرمایشی تۆ "قادر"! زۆر جوانە وەکوو قەندە
حاشا کە نە من لۆتیم، حاشا کە نە تۆ لاتی

# نامەی ئاوات بۆ سەیید (٤)

مـن هـاتم و تـۆ ڕۆیـی، تـۆ ڕۆیـی و مـن هـاتم
زانیوتــە بــە قەولــی وان تــۆ لــۆتیی و مــن لاتــم

گــاهێ کــز و گەه مــاتین، گەه لـۆتیی و گەه لاتــین
ڕووکەینــە دەر و دەشــتان، تــۆ هــار و ئەمــن مــاتم

تۆ ڕاوچیی و مـن هەوچـی، بـا پـێکەوە حـازر بـین
گوێ مەگرە قسەی خەڵکی، وەک من بە؛ کە ڕاهـاتم

ســەرلەوحەیی گۆڤــارە باســی منــی بێچــارە
یــا شــوهرەیی ئافــاقم، یــا تــوعمەیی ئافــاتم

کەوتوومە سەری ئەوسـەر، هەرکەس چ دەڵـێ بیڵـێ
دەرحەق بــە قســەی خەڵکــی بێقەیــد و موبــالاتم

بــا هەر بــە خەیــاڵ یــارۆ، ئێمــە بــە فەقیــر دانــێ
تــۆ خوســرەوی خووبــانی، شاهەنشــەهی شــاماتم

شایی دەوێ ئەو، سـەیرە؛ دەس بگـرە، مەڵـێ لەنگـم
هەڵپەڕکەیەکـی بگـرین، تـۆ دەس گـرە، مـن پـاتم

گەر چا بێ کەلامی مـن، سینەش کـە سـەماوەر بـێ
شــیرینە وەکــوو قەنــدە، هەڵبەســت و مەقــالاتم

قوربــانی وەفــاتم مــن، "قــادر" قەدەمــت بێــنە
سـەر چـاوی حەزینـی مـن، حـازر لـە گوزەرگـاتم

قاقڵاوا، ١٣٣٩ی هەتاوی

# نامەی سەیید بۆ ئاوات (٥)

ژیـانی مـن بـە دەرد و داخ و ژانـە، هەر بـە نێـو ژیـنە
کەسـێ نەیچێشـتبێ ئەم تاڵییـە لای وایـە شـیرینە

لەمێژە دەنگـی تـۆ نایێتـە گـوێ، "کامیـل"! چ قەومـاوە؟
ئەتۆ لاڵ بووی؟ زمانم لاڵ بێ یا گوێی ئێمـە سـەنگینە؟

بـراکەم! شـێعری تـۆ نـاڵەی دڵـە، هەر دڵ دەلاوێنـێ
بەڵـێ بـۆ دەردەداران لایەلایـە دەنگـی نـاڵینە

زەمانێ بولبولی دەنگ‌خۆشی ئەم گـوڵزارە بـووی، ئێسـتا
نـە دەنگـی نـاڵە وو نایـە، نـە ڕەنگـی جوانی نەسـرینە

هەچـی دەنگێکـی دەبیسـتم دڵـم دێنێتـە ژان ئەمـڕۆ
سـکاڵای مـل بەکوێنـە هەر سـەدای ڕۆڕۆیـە، یـا شـینە

بـە سـەرما هێنـدە گریـاوە مژۆڵـی پێ‌نەمـا چـاوم
لە باخچە و باخی بێ‌خاوەن دەچێ بـێ‌هەژگ و پەرژینە

لەسـەر چـۆم و شـەتان فێنکـایی ئـاوێکم نەدی کـاکە!
هەمووی خوێناوی جەرگـی لەت‌لەتـە، لـێڵاوی ئەسـرینە

لەبـاتی قاسپەقاسـپی کەو، پەپـوو دەخـوێنێ لەم هەردە
لەبـاتی لالـە و سـونبوول لـە باخـان هەر دڕوو شـینە

ئەمن بۆخۆم کە خەمبـارم دەڵـێم هەرووەک منـە "سـەیید"
لـە چـاوی لالەوە هەرکەس دڵـی داخێکـی خـوێنینە

# نامەی سەیید بۆ ئاوات (٦)

دەمێکە زەمزەمەی شێعرێکی تۆم کاکە! لە گوێ نایە
لە کوێستان و چیا سەرسەوزەکان قاسپەی کەوێ نایە

گوڵی باخی ئەدەب گەر تۆ نەبی، من بچمە کام گوڵشەن؟
کە هیچ باخ و گوڵێک ئەو بۆنە خۆشەی خۆتی لێ‌نایە

هەموو سەرچاوەیەک کوێر بێتەوە خۆ ئاوی نامێنێ
کەچی سەرچاوەکەی چاوم دەبوو وشکایی بێ، نایە

لە ناخی سینەوە هاسان هەناسەم نایەت و ناچێ
کزەی بای وەعدەکەی خۆمە، دەمێ دێ، سەردەمێ نایە

لە هەرلا دڵ بەجێ دێڵم بحەجمێ و بگرێ ئارامێ
لە هیچ لایێکی‌دی، لای تۆ نەبێ، خۆ دڵ بەجێنایە

نەخۆشی دەست و پێی بەستووم و دەنگیشم بە کەس ناگا
خرەی زەنجیر و دەسبەندی کەسی بێ‌دەستوپێ نایە

دڵی ناردۆتە لات "سەیید" کە نەیتوانیوە بۆخۆی بێ
درەنگی پێ‌دەچێ ئاخر بە سەر دێ، خۆ بە پێ نایە

## نامەی ئاوات بۆ سەیید (٧)

قادرا! ئەمن ـ دەزانــی ـ عەسام گـرت بـە دەسـتەوە
کەوتـــووم لەپـــێ بفەرمـــوو دە "کامیـــل" هەڵســـتەوە

هەســـتانی مـــن بـــرا! بـــە عەســـای زولفـــی یـــارمە
گەر بـێ بـە لارولەنجـە، بـە دوو چـاوی مەسـتەوە

بـــاری دەکەم ئەگەرچـــی گرانـــە بـــە دەرد و خەم
بەو حـــاڵەوە بـــە مـــوویێکی زولفـــی دەبەســـتەوە

خـــۆ گەر پســـا دڵـــم، دەکەوێ، دەشـــکێ، ناســـکە
ئەوچەل چ چـــارەکەم بـــە دڵێکـــی شکەســـتەوە

"ئـــاوات"ە قەت نەهاتـــە جـــێ ئـــاواتی "ســـەییدا" !
هیـــوام نەمـــاوە کاکـــە! بـــە ڕۆحێکـــی خەســـتەوە

## نامەی سەیید بۆ ئاوات (٨)

چوومـــە "قـــاقڵاوا" مـــاڵی "ئیمـــامی"
دەردەدارێـــک چـــوو بـــۆ دەوای زامـــی

مامۆســـــتای گەورە و بەڕێـــــز و زانـــــا
وێـــــنەی کەم مـــــاوە لـــــە موکریانـــــا

ئەســـــتێرە گەشـــــەی بەری‌بەیـــــانە
بەجێ‌مـــاو لـــە ڕێـــی شـــەوی ژیـــانە

هەرچەن جێگـــاکەی چـــۆڵ و کەنـــارە
مانـــگ لـــە هەرلایەک هەڵبـــێ دیـــارە

مـــاوە لەو دێیـــە ئەو زانـــای نـــامی
"قـــاقڵاوا" جامـــە و "ئیمـــامی"ش جـــامی

کـــــابەی ئامالـــــە ئەو بارەگـــــایە
جێـــــی ڕاز و نیـــــاز لەگەڵ خـــــودایە

دەنگـــی تەهلـــیلەی ســـۆفی شـــەوانە
عەرشـــــی خودایـــــان دێنـــــا جـــــۆلانە

لـــــە خانەقـــــادا گەلـــــی دەروێشـــــان
ســـــەریان شـــــۆریدە، دڵیـــــان پەرێشـــــان

لـــە وەختـــی زیکـــرا دەرویشـــی دڵڕێـــش
پرچـــی وەک دڵـــی پەرێشـــان دەروێـــش

هەرکەس ســەری خــۆی هەڵگــرت و ڕۆیــی
دەروێـــــش و ســـــۆفی زەوار و خـــــۆیی

ئەوەی بەوەفـــا و خـــاوەن کەرەم بـــوون
هەر کۆترەکـــانی دەوری حەرەم بـــوون

ئەوانـــیش فـــڕین ڕوو بـــە هەوا بـــوون
ئەوانـــیش وەک مـــن ســـەربەهەوا بـــوون

لـــە دۆســـتەکانی خـــودا کەس نەمـــا
خـــودا خـــۆی مـــاوە بەتـــاقی تەنیـــا

چ جێـــیەک بچـــم دڵ لێـــی بە جـــێ بـــێ
مـــن بچمـــە کـــوێی دی بـــۆنی وی لـــێ بـــێ

## وەڵامی شێعری ئاغا سەید قادری سەیادەت

بــۆ وەڵام هــۆنەر دەڵــێ: مــن قــامەتی یــارم دەوێ
یاری زانا و شۆخ و شەنگ، خۆش کار و ڕەفتــارم دەوێ

نــامەوێ وەک بــووکی شــاران خــۆ بــڕازێنێتەوە
بــێ بەر و بەرمــوور و بــازن، یــاری ســاکارم دەوێ

هەروەکوو لاولاو نەپشــکووتوو، وەکــوو بــووکی بەخــت
دڵــــبەری باڵابلنــــد، شــــیرین و عەییـــارم دەوێ

زولفەکەی گەستوومی وەک دووپشکی ڕەش، بەو حاڵەوە
بەژن و بــاڵا و لار و لەنــجە و زولفــی ڕەشــمارم دەوێ

گەر نەخۆش بم بێتە لام پــێم خۆشــە، بــا هەر کەوتــبم
ڕۆژ و شــەو داوا دەکەم مــن: گیــانی بیمــارم دەوێ

گیان بە عەشقی یار نەسووتێ، سەر لە ڕێی وی‌دا نەچــێ
هەر دوو دەفرۆشــم بە پوولێــک و خەریــدارم دەوێ

کــاکی "ئــاوات"! هەڵگــرە دەســتت لە شــێعر و بەنــدوباو
تۆ کە پیــر بــووی هەر بڵــێ: مــن ڕەحمــی دادارم دەوێ

قاقڵاوا، ١٣٦٠ی هەتاوی

# وەڵامی سوارە ئێلخانیزادە بۆ ئاوات*

نامەکەی نامی کە حاکی لوتفی سەرشار بوو گەیی
شێعری ڕێکت مەرهەمی قەلبی بریندار بوو گەیی

داری پڕ بەرگ و لقی دڵ زەرد و زار و وشک و ڕووت
شێعری ئاوداری جەنابت ئاوی جۆبار بوو گەیی

بۆ منی بەدبەخت و بێچارە و زەلیل و پڕ لە غەم
نامەکەت دەسکێک گوڵی بۆنخۆش و بێخار بوو گەیی

واسیتەی قاسید لە وەختی فکر و ئەندێشە و خەیاڵ
کاغەزت بۆ من چەکیدەی فکری ئەحرار بوو گەیی

لوتفی بێحەدد و حیسابت قووەتی ئیخلاسمە
شێعرەکانت باعیسی فرمێسکی خوێنبار بوو گەیی

من وەکوو حەزرەت لە شێعرا "کامیل" و بێعەیب نیم
شێعری بێعەیبت کە مایەی عوجبی حوززار بوو گەیی

---

* ئیمامی لە کاتی نەخۆشیی کاک سوارەدا نامەیەکی لێپرسینی بە شێعر بۆ دەنووسێ کە بەداخەوە دەقەکەی نەماوە و وەدەستیش نەکەوتووە.

## وەڵامی ئاوات بۆ مستەفا ئێلخانیزادە

چلـــۆن ســـارێژ دەبـــێ زامـــی ئەوینـــدار
عیلاجـــی نـــایە خـــاوەن یـــار و دڵـــدار

کەســـێکی مفـــتەلای دەردی ئەویـــن بـــێ
دەبـــێ بەو دەردەوە بـــڕواتە کۆســـار

بەجـــاریٚ شـــێتوپێت بـــێ ئەو کەســـی بـــوو
گرفتـــاری بەر و خـــاڵ و خەتـــی یـــار

عەشـــق خـــۆی دەســـتەچیلەی ئـــاوری مەرگە
چـــووە هەر مـــاڵێ، هەر هـــاوارە، هـــاوار

کەســـــــێکی کەوتە داوی گوڵعـــــــوزاران
دەبـــێ وێڵـــی بـــکەن خەڵکـــی بە ناچـــار

لە مەکتەبخـــــانەیی شـــــێعر و ئەدەبدا
ئەتـــۆ نووســـرای بە زانـــاییکی وشـــیار

بە شـــاگردیت قەبـــووڵ ناکـــا "ئیمـــامی"
ئەتـــۆ خـــۆت هـــۆنەری، کـــاکی هـــونەردار

# نامەی ئاوات بۆ نووری*

نــووری! ئەی مــایەیی ژیــن و گــوڕ و تینــی ئــاوات!
ئەی وتەی شیرن و جوانت هەموو وەک نوقڵ و نەبات

مــن بە ئــاواتی دڵــی خــۆم نەگەیشــتم، پیــر بــووم
چــاکە بێمیننەتــی پــێ هــاتمە ڕێــی هــات و نەهــات

زۆر لەمێــــژە وتووێـــژت کە لەگەڵ مـــن نەبـــووە
گێژووێــژم، کــرِ و کــاس، غەم لە دڵــم بــۆتە قەڵات

مەڵــی دڵ ئێســـتە لەلای تــۆ نیــیە، لێــت تــۆراوە
بە دوو ســێ شــێعری بلاوێــنەوە، بــا بێــتەوە لات

دەڵـــێ مـــاوێکە هەواڵێکـــی نەپرســـیوە لە مـــن
چـــاکە ئـــاوارە بـــبم، بچـــمە کەژ و کێـــوی وڵات

* محەمەدی نووری، شاعیری هەستناسکی "بستووی ژیان".

## وەڵامی نووری بۆ ئاوات (١)

ئەی بە سەربەرزی ژیاوی لە هەموو کاتی حەیات!
ئەی نەوەستاوی لە هەنگاوی بەرەو بەرزی وڵات!

ئەی لە گوڵزاری ئەدەبدا گوڵی تێراوی بەیان!
ئەی لە ئاسمانی هونەردا دەشەکێ نێو و نەوات!

هیممەتی پیرە دەپێوێ هەموو مەودایی زەمان
پێ چیە بێت و نەبێ، ڕێگە چیە هات‌ونەهات؟

بەخودا مەستی هەواتە ئەوی هەستێکی هەیە
سەرە پێبازە لە بەر پێت و دڵە پڕ لە هەوات

ویشکەڕۆ ماوە دەروون و کپە مەڵبەندی وتار
قۆرغی قاڵاوە هەرێم چینە لە چی کا عەنقات

ئەو دڵەی کانگەیی هیوا بوو بە ئاوات دەژیا
لەتکە خوێنێکە لە خۆیدا دەتەپێ کات و سەعات

شەمی بێ«نووری» کوژاوەی شەوی تاریک و تەمم
وەرە ڕوونمکەوە ئەمجارە بە ئەنفاس و دوعات

بۆکان، بەفرانباری ١٣٦٢ی هەتاوی

## نامەی ئاوات بۆ نووری (۲)

تەیــری دڵ بــێپەڕوپــۆ، تەپکــە شــکاوێکی بەســە
چــاوەڕێی تۆیــە کــە بێــی، گەرمەســلاوێکی بەســە

مەڵــێ زســتانە، جلــی پیــر و فەقیــر پــارە بــووە
ڕۆژی ڕووت دەرخە، هەتیو تـۆزە هەتـاوێکی بەسە

پـــاییزە، فەرمـــوو تەماشـــا بکـــە لانەوخـــوارم
پیرەکەرویشــکێ لــە گــوڕ کەوتبــێ، ڕاوێکــی بەســە

ئەو هەموو زولفە بـە زەنجیـری مەکـە بـۆ ملـی مـن
تەیــرێ وا بێپەڕوبـــاڵ کەوتبــێ، داوێکـــی بەســە

ســـــەیید و پیـــــر و فەقیـــــرم، وەرە لـــــێم قەومـــــاوە
بــۆ منــە ئەو مەســەلە: «بــاوەڵێ بــاوێکی بەسـە»

وا بە ســــەرڕووتیی و پێخاوســـــی هـــــاتۆتەوە لات
"کامیــل"ت جووتــە کڵاشــێک و کڵاوێکــی بەســە

هێندە هەر هاتم و چووم، خۆزگــە بــە دۆم دەخــوازم
پیرەدۆمێکـــــی هەژار جـــــاوە دڕاوێکـــــی بەســـــە

**بۆکان ۱۳۶۳ی هەتاوی**

# وەڵامی نووری بۆ ئاوات

هەستی نێژراوی دەرێناوە لە ناو گۆڕی سکووت
مەسەلەی کۆنی دەڵێن «باوەڵێ باوێکی بەسە»

باوەڵێ، دیارە کە شەمزاوی بە باوی گەردوون!
خۆ دەنا زوقمە حەریف خۆی بزەتاوێکی بەسە

باوەڵێ، بادەوە سەر باو و گوڕی کاتی کوڕی!
شیر هەتا کۆن بێ دەڵێن هەر لەپەساوێکی بەسە

گێژی گێژاوی بەڵا بێ ئەوی دەشکێنێ دڵت
لای خودا دەستی دوعا قەلبی شکاوێکی بەسە

بە چەکی شیری برۆ و تیری بژانگ هەڵمەکە دڵ
شیر و تیر بۆچی دەسووی سیلەیی چاوێکی بەسە

نەتەوی بۆچی بزانێ بە هەموو هەستی دەروون
دڵ بە دڵ ڕێی بێ هەرای بۆچیە قاوێکی بەسە

بۆکان، ١٣٦٣ی هەتاوی

# نامەی ئاوات بۆ نووری (٣)

بۆ نەهاتی گیانەکەم، دەعوەت کرای
خۆ لەگەڵ "ئاوات" لەمێژە تۆ برای

هێندە شیرینن برام! خۆت و وتەت
هەروەکوو قەند، هەربینا ڕۆژێک خورای

زوو بە تەنیا شاعیرێک بووی و بەڵام
ئێستە مامۆستایەکی داستانسورای

بەو هەموو تەبع و قەریحە جوانەوە
کاکە! بۆچت کردووە، بێدەنگ کرای؟

خۆ لە ناو کۆڕی ئەدیبانی زەمان
زۆر بە زانا وو بلیمەت ناسرای

"نووری"! تۆ وەک نووری ڕۆژی ڕۆشنی
سەد چەلیش خۆ ون بکەی، هەر ئاشکرای

بۆ شەوی شیعریش ئەگەر ناردیان، بچۆ
چونکە بۆ ئەو مەجلیسە تۆ شەوچرای

**قاقڵاوا، ١٣٦٢ی هەتاوی**

# وەڵامی نووری بۆ ئاوات

سەروەرم وا هەڵکەوت ئەورۆژە وا دەعوەت کرام!
لەش بەباری خەستم بۆ نەخۆشخانەی برام

کۆڕی گەرمی هۆنەرانی ڕێنەدام جەوری زەمان
بەختی نوستوو کاری خۆی کرد وا لە «ئاوات» هەڵبڕام

داری ویشکی بێ‌بەروبارم لە کێوپارەی ژیان
بۆ مەلی ڕێبواری شەو بێ‌جێ وەبەر بیوران درام

هەوری غەم تاریک دەکا ڕۆژێ کە «نووری» دەرکەوێ
کەی لە نێو تەیمان و تانەی ڕێگراندا ئاشکرام؟

تۆی لە مەیدانی ئەدەبدا شاسواری بێ‌نەزیر
بۆ شنەی شەوگاری شێعریش تۆ چرای، من پاچرام

دەست و پێیان لێک‌دەدەم بۆوەی کە "ئاوات" سەرکەوێ
ڕۆژی ڕەش مەودای نەدامێ هەر بە زیندوویی مرام

دەرکی داوام داخراوە گوێچکەیی گەردوون کەڕە
خۆ دەنا ئاسانە ببیە ئاسمان دەنگ و هەرام

بۆکان، ساڵی ۱۳۶۲ی هەتاوی

# نامەی ئاوات بۆ خاڵەمینی بەرزەنجی (١)

هەروەکـــوو ماســـی لە نیـــو گـــۆلاوی لـــێڵاوم ئەمـــن
هەڵدەســـوورێم بـــێ‌دەس و پـــێ، تـــازە شـــێواوم ئەمـــن

تـــۆ بـــبە غەوواس، دەرمبێـــنە لە ئـــاو تۆخـــوا، کەســـم!
خـــاڵە گیـــان فریـــاکەوە، تـــاکوو نەخنکـــاوم ئەمـــن!

هەمقەتـــار بـــووم خـــۆ لەگەڵ یـــاران لە مزڵێکـــی ژیـــان
کـــاروان ڕۆیشـــــت و نەمزانـــــی، بەجێ‌مـــاوم ئەمـــن

من کە پیر بووم و لە قیس چـووم، خـۆ بەڵام بەو حـاڵەوە
جـاری واشـــە دێـــمە ڕیـــزی جـــوان دەڵـــێم لاوم ئەمـــن

خـاڵە گیـان! چاوێـک لە ئەنـدامی لەبەریەک چـووم بـکە
هەروەکـــــوو لانکەشـــــکاوێکم کە چـــــڕژاوم ئەمـــــن

دار و پەردووی لەش دەس و پێیە، ئەویشم چوو لە دەست
لانـــکە نـــا، ئەمجـــارە هەروەک مـــاڵە ڕووخـــاوم ئەمـــن

نـــایەتە جـــێ تـــازە خـــاڵە ئـــارەزووی "ئـــاوات"ی پیـــر!
هەر دەبـــێ بانـــگ کـــا، بڵـــێ خـــۆ تـــازە فەوتـــاوم ئەمـــن

قاقڵاوا، ١٣٦٥ی هەتاوی

## نامەی خاڵەمین بۆ ئاوات

هەســـتە نـــاقیس! بنووســـە بـــۆ "کامیـــل"
شــــێعری تـــازە و تەڕ و بەتـــام و خـــوێ

دوای ســـڵاو و دەســـی لە ســـەر ســـینگت
بڵـــێ بـــۆ زیـــارەتێکی بـــیمە کـــوێ؟

دڵـــی مـــن ڕۆژ و شـــەو لە بیـــری ئەوا
دڵ و گیـــــانم بە یـــادی تـــــۆ دەدوێ

هەر مـــــنم دڵ دەداوی تـــــۆ کەوتـــــوو
هەر ئەتـــۆی ڕاگـــری منـــی بە مـــوێ

دڵـــــی ویـــران و شـــێعرەکانی تـــــۆش
هەروەکـــوو جەرگـــی خـــۆمە، توێبەتـــوێ

باشـــە چیـــدی ســـەرت نەیێشـــێنم
هەر بـــــژی بەو زووە لەشـــــت نەپـــوێ

"خـــاڵە" بـــۆ دۆســـتیت هەتـــا مـــاوە
وەکـــوو کێـــوە، لە جێیخـــۆ نـــابزوێ

نەغەدە، ١٣٦٠ی هەتاوی

# وەڵامی ئاوات بۆ خاڵەمین

هەستە کامیل! کە خاڵەمین دەدوێ
جوان دواوە، لە ڕۆحی ئەمنی کەوێ

بیر و هۆشت وەکۆکە بشزانە
خاڵە داخۆ سەری لە چی دەسوێ

خاڵەگیان! پێش ئەوەی کە نامەت بێ
پاکی جەرگ و دڵم ببوو توێتوێ

هۆنراوەت بە ڕێکوپێکی گەیشت
مردبووم من، ژیامەوە لە نوێ

یا خودا هەر بژی بە بیروڕا
پێت لە ڕێگەی خەباتی گەل نەسوێ

هەر بژی تا دەگەی بە ئاواتت
بەرهەڵستت نەبێ هەتا سەر سوێ

خەم نەبێ خاڵی من بە خەم هەرگیز!
بەژنە بەرز و بەڕێزەکەت نەنوێ

تۆ دەفەرمووی کەسێ بچێ بۆ نوێژ
جێبەجێ خۆ بە گوللەیەک دەنگوێ

خــۆ ئەوی نــاچتە دەر لە مــاڵی خــۆی
بــە خــەم و دەردی وانــەوە دەپــوێ

مــردنە، کوشــتنە بەشــی کــوردان
تەرمەکەش تــوورِ دەدا و بــۆی دەلــوێ

کەژ و کێــوی مە بــۆتە قەبرســتان
گــوڵی هیــوا بە خــوێنی گەل دەڕوێ

**قاقڵاوا، ١٣٦٠ی هەتاوی**

# نامەی ئاوات بۆ خاڵەمین (۲)

هاوین بوو، گەرم بوو، ساڵی شەست و سێ بوو
نامەی گوڵی دڵ گەیشت، دەزانی کێ بوو؟

خاڵیکی عەزیز بوو، ناردی هۆنراوەی جوان
جوان بوومەوە بەو نامە، ژیانی پێ بوو

یا خوا قەڵەم و دەست و دڵی باقی بێ
خاڵ بوو لە دڵم خەیاڵی نیشتەجێ بوو

پێش هاتنی شیعرەکانی ڕێکوپێکت
جەرگ و دڵی "کامیل"ت هەموو توێتوێ بوو

ئەو نامە کە قووتی ڕۆحی من بوو خاڵە!
زۆر خۆش بوو لە لام، چونکی بە تاموخوێ بوو

فەرمووتە لە کوێیی کە بێمە لات تاوێکی
بۆ هاتنی تو دڵم سەری لە سوێ بوو

هەرچەندە کە خوێنمان حەڵاڵە لای وان
هەرلایە دەچووی تەرمی جوانی لێ بوو

بـــــــڕوانە بەڵام شــــــوکور بە ئـــــــازادی دەبەن
نێــوی گەلــی کــورد لە شــاری یــا لادێ بــوو

هەروا نەبەزیــــوە قارەمـــــانی گەلـــــی کــــورد
بەو باســـە ژیـــا کـــوردێ ئەگەر گـــوێی لـــێ بـــوو

تــۆی خـــاڵە! کە بــوویە هــۆی وتــاری "کامیــل"
تەبــع و غەزەل و فکــری دەنــا لە کــوێ بــوو؟

**قاقڵاوا، هاوینی ۱۳۶۳ی هەتاوی**

# نامەی سەلاحەددین ئاشتی بۆ ئاوات*

سەیدی پیرۆزی ئازیز! یادی تۆ دەمدا دنە
دڵ وەکوو پولوویە قوربان! تۆش کە لێم بوویە شنە

ڕێی ئەوین ئاورینگە، دێت و زیڕوەشانی لێ دەکا
خۆشەویستی ئارەزوویە بێسنوور و گوڵچنە

من شەوم دایم بە دەوری خورشیدی خاوەردا دەڕۆم
ئەی هەتاو! ڕاوەستە تاوێ، شەو خەریکی سووتنە

هەر بە دووتا دێم هەزاران جار بەجێمبێڵی و بڕۆی
شەم پەپوولەی چۆن نەوێ. ئەو وا مەبەستی دیتنە

پال وەلاشیپانی دەرگاکەت دەدەم ئەوسا دەڵێم
پێکگەیشتنمان بە مەرگیشم تەواو بێ شیرنە

ئەو وتەی لێوتی بە نیوی نیشتمانێ کردەوە
زەردەیی ڕوونـاکییە، مـوژدەی لە کەل سەرکەوتنە

قەفقەفی کێو و چیا کوا بەرگری بیرم دەکا
ئاخری هەر پێدەگەم ڕۆژێکی، ئاسۆ ئی منە

---

* نامەی "سەلاحەددین ئاشتی". خۆشەویستی ئاوات لە کاتی سەربازیدا کە لە شاری بووشیهرەوە ئەو شیعرانەی لەگەڵ نامەیەکی چەند لاپەڕەیی بۆ "ئیمامی" نووسیوە.
١٣٦٥/١٠/١٠ شمسی

# وەڵامی ئاوات بۆ ئاشتی

هــۆنەری زانــا و بەڕێــزم! یــادی تــۆ یــاری منــە
گەرچــی وێــنە جــوانەکەت ئێســتا. لە بەرچــاوم ونە

وا پەرێشــان و هەراســانم، بە مەرگــی تــۆ ســەلاح!
بــا بزانــی مەرگــی مــن گیــانە لە تــو دوورکەوتــنە

تــۆ کە نووســیوتە ئەوا لێــرە بەهــارە و خۆشــییە
بــای شــەماڵ دەشــنێ لە مەڵبەنــدی هەڵاڵە و سوێســنە

هەروەکوو فەرمووتە دیــارە شــین بــووە ســەحرا لەوێ
ڕۆژی ســەیرانە و پیاســە، کــاتی گــوڵ پشــکووتنە

شاد و خۆشحاڵم کە مــوژدەی خــاکەلیوەت دا بە مــن
بەو هەواڵە بولبــــولی تەبعــــم ئەوا کەوتە قــــنە

بــۆچی ناشــوکری نەبــی، لێــرە هەوا ســارد و ســڕە
بای شەماڵ ساردە، کوژەی منداڵ و ســەد پیــاو و ژنە

زوو، کە من ئاورم بەتــین بــوو، عــالەمی سووتاندبوو
ئێســتە ئــاگردانەکەم هێنــد ســاردە جیــی لــێ نووســتنە

تا تەنوورم گەرموگــوڕ بــوو، نــانی گەرمــم هەر نەدی
ئەو ئەوا دامــــردووە، خۆشــــم ئەوا بــــوومە پــــنە

کــاکی "ئــاوات"ە لە ســەرمان هەڵــدەلەرزێت و دەڵــێ:
بۆچی خۆری گەرمی گەل هەروا لە سووچ و قوژبنە؟

قاقڵاوا، ١٣٦٥/١٠/٢٠ی هەتاوی

## نامەی هێدی* بە ئاوات

بـــه کویـــت آیـــم و گریـــانم و روی تـــو می‌جـــویم
تـــو را گـــم کـــرده‌ام، دیـــوانه‌ام، خـــاک تـــو می‌بـــویم

جـــــوانمردا! بیـــــا، قربـــــان بـــــازوی توانایـــــت!
در ایـــن مـــاتم مـــرا دریـــاب و خـــود برگیـــر بـــازویم

بمیرم گر ز هجرانـــت، ازیـــن شـــادی بـــه رقـــص آیـــم
که بعد از مرگ، چـــون لالـــه بـــه بـــالین تـــو مـــی‌رویم

قلـــم زان رنـــج بی‌حاصـــل فغـــان ســـر داده، می‌نالـــد
چـــو مـــن اوراق گویـــایش بـــه آب دیـــده می‌شـــویم

ملامـــــت‌گوی پنـــــدم می‌دهـــــد، لـــــیکن نمی‌دانـــــد
که من خود بی‌خبر از خویشـــم و از آنچـــه می‌گـــویم

نـــه چـــون پـــروانه‌ام بوســـه ز روی شـــمع بـــردارم
غریقـــــی هســـــتم و بهـــــر نجـــــاتم در تکـــــاپویم

بســـوزم در تبـــت، امـــا جـــز ایـــن جرمـــی نمـــی‌دانم
چـــرا پیـــدا نه‌ای، آخـــر تـــرا خـــواهم، تـــرا جـــویم

بیـــا جـــان "حســـامی" بـــاد قربانـــت! کجـــا رفتـــی؟
که با دست تو خواهم پـــاک کـــردن، اشـــک از رویـــم

**مهاباد، ۱۳۴۰ شمسی**

---

* خالید حیسامی (هێدی)، شاعیری هەستناسکی "کاروانی خەیاڵ"ە.

# جواب آوات به هێدی

رسید آن نامەی پر مهر تو من نیز می‌گویم:
خدایا شاد کن از فیض خود آن یار خوش‌خویم

چنان در قلب من هستی که بیرون رفتنت "خالد"!
محال است از دل تنگم، تو می‌خواهم، تو می‌جویم

ز بخت بد چه حاصل مردن از غم زانکه می‌دانم
چو لاله نیز بر بالین یار خود نمی‌رویم

به باغ داغداران محبت بنگری دانی
که من یک چوب خشک و کهنه و بی‌برگ و خودرویم

چو مجنون در بیابان جنون در جستجوی او
چو او بنشسته رنگ مرگ بر جان و سر و رویم

ز هجر دلبرم از جان خود چندان هراسانم
که مرگم نیز نتواند نشیند یک‌دمی سویم

بیا جان "امامی" باد قربان وفای تو!
که از آب شراب مهر تو چرک جفا شویم

قاقلاوا، ۱۳۴۰ شمسی

# زەماوەندی بەهار*

وەرن سۆفی! وەکوو دەرویش بکەونە گاڵەگاڵ ئەوشۆ
وەرە نێو باغی عیشرەت، ئەی نەمامی چاردەساڵ! ئەوشۆ
بدە جام و مەزەی ماچت لە کوڵم و لێوی ئاڵ ئەوشۆ
بە سروەت پێدەڵێم چاوم! کزەی دێ بای شەماڵ ئەوشۆ
چزەی دێ جەرگی برژاوم بەبێ پۆلوو و زوخاڵ ئەوشۆ

دەری پیری موغان ئاوایە، قاپی مەیکەدە وازن
جحێڵ و پیر و منداڵ مەیگوسار و بادەپەردازن
سوراحی کەیل و موتریب مەست و ساقی سادە وو سازن
کوڕوکاڵ دەمبەخەندەن، کیژوکاڵ پڕ عیشوە وو نازن
بزەی دێ غەمزە وو ڕەمز و ئیشارەی چاوی کاڵ ئەوشۆ

زەماوەندی بەهارە، کاتی سەیران و شەق و گۆیە
سەبا بەربووکە، زاوا عەندەلیب، پەردە کەنار جۆیە
دەسا بولبول لە پێشوازا بخوێنە، داوەتی تۆیە!
سەراسەر فەرشە چیمەن، بۆ قودوومی بووکی گوڵ، بۆیە
زمانی گرتووە هەر چەشنی تووتی، کوندە لاڵ ئەوشۆ

* پێنج‌خشتەکیی خوالێخۆشبوو "قازی کاکەحەمەی قزلجی" لە سەر غەزەلی "ئاوات".

لـــە خەڵوەتخـــانەیی خـــاڵوبەڵەکدا خاســـەکەو جـــووتن
لە سەر سفرەی چەمەن، شـەونم مەیـە، گـوڵ جـامی یـاقووتن
شـنە و سـروەی بەیـان تـێکەڵ هەناسـەم بـوون و ئەنگـووتن
بـە تەشـریفی نەسـیم، شـەوبۆ و نێـرگس پـاکی پشـکووتن
لە خۆشـیان بولبـول و قـومری دەکەونـە قیـلوقـاڵ ئەوشـۆ

وەنەوشـــە لارەمـــل، دامـــا لـــە مەیـــدانا بـــە تەنیـــایی
ئەوا نەســـرین ســـەری بـــۆ پردەبـــاز ڕۆنـــا، بە تەنیـــایی
ئەوا ڕۆژی لە قـیس چـوو عاشـقی شـەیدا بـە تەنیـایی
ئەوا هەر چاوەڕێیـــە نێرگســـی شـــەهلا بـــە تەنیـــایی
بە جـارێ بـوو سـپی چـاوی بـە ئومێـدی ویسـاڵ ئەوشـۆ

شـــکۆفە پێکەنـــی ڕووی کـــردە سوێســـن یانیهـــا بگـــری
نەمـــا ئەهریمەنـــی زســـتان، وەلاچـــوو شـــیددەت و قەهـــری
هەزار قەوس و قەزەح ڕابـوو بـە ڕەنگـی تـاووس و چەتـری
بـە دەنگـی بولبـول و قـومری، تەماشـا دڵ چلـۆن دەگـری!
دەڵـێ بگـــرن بـــە دڵ قەدری، جەمـــاڵی کیژوکـــاڵ ئەوشـــۆ

چنـــار گەییـــە چنـــوور، پێچـــرا ســـنەوبەر پەرچەم و ســـونبوڵ
ئەوی نەختـــێ لە کـــارا بـــوو گەیشـــتە مەقســـەد و مەنـــزڵ
بـــەتەنیـــا هەر "قزڵجـــی" کەوتـــە دووی خێـــڵ و نەگەییـــە دڵ
"ئیمـــامی"ش هەروەکـــوو بولبـــول بە هیـــوای پێکەنینـــی گـــوڵ
دەنـــاڵێنێ لە ســـەر هەر چـــڵ، بە یـــادی خەتـــتوخـــاڵ ئەوشـــۆ[1]

**بۆکان ۱۳۳۶ شمسی**

---

[1] خوالێخۆشبوو ئاوات لە دەفتەرەکەی و لە ژێر غەزەلەکەی خۆیدا نووسیویەتی: «یک شعر تخمیس نشده». (جەعفەر ئیمامزەنبیلی)

# شینی ئاوات

**حەقیقی**

تەم بە سەر چاوم کشاوە، یا نە ڕۆژ ئاوا بووە؟
شەو بە بەژنی ڕۆژ بڕاوە یا قیامەت ڕابووە؟

مانگی خەرمانانە بولبول بۆ نەناڵێ پێشەکی؟
باغی گوڵ خاڵی دەبینێ بۆیە وا شەیدا بووە

خاسەکەو چیدیکە ناخوێنێ لە کوێستانی وڵات
خاڵی سوور و ڕەش لە کوێ وەک شێعری تۆ ئینشا بووە

داخەکەم بۆ شۆڕەسوارێکی لە مەیدانی شەڕەف
داری تەقڵەی ڕووی لە پشتی قەیسەر و دارا بووە

تۆی کە زیندووت کردەوە نێوبانگی ئالی بەرمەکی
ئەو شنەوتوومانە، تۆمان دیوە، ئەی کەی وابووە؟

شاعیر و دەنگخۆش و تیرئەنداز و سوارچاک و سەخی
چی ڕەوشتی چاکی ئینسانین، لە باڵ تۆدا بووە

شا نەبووی و لافی شاییت لێنەدا، وەک شا ژیای
بۆیە نێوبانگی شیاو، شایانی "کامیل شا" بووە

گەرچــی زۆر پــاڕامەوە مەرگــم وەپــێش مەرگــت کەوێ
تــۆ کــە "ئــاوات"ی بڵــێ ئــاواتی کــێ ئیجــرا بــووە

شێســـت و حەوت ســـاڵە ڕەفیقــی گیــانی‌گیــانین پــێکەوە
خوشەویســـتیمان لەلای یەک ئێســـتە هەر ســـاوا بـــووە

"خانەقای زەمبیل" و دەرسی مەدرەسەی "باخچەی گوڵان"
ئەودەمی خــۆش بــوون کــە حاڵ‌وقــاڵی تــۆی تێــدا بــووە

بولبــولی بــاغی ئەدەب ڕۆیــی لە نێــو بــاغی گــوڵان
گوڵ وەری ئێستا، لە جێگەی سووری، شـین بەرپـا بـووە

بــۆ مەگەر پــاش تــۆ چەلێکــی دی قیــامەت ڕادەبــێ؟
بــۆ مەگەر ئەو مەحشــەرە جــارێکی دیــکەش ڕابــووە؟

بۆ مەگەر ڕۆڵێکــی دی وەک تــۆی دەبــێ دایکــی وەتەن؟
یــا یەکــی وەک تــۆ لــە خــاکی نیشــتمان پەیــدا بــووە؟

بــۆ مەگەر ڕۆژێکــی دی هەڵــدێ لــە مەڵبەنــدی وڵات؟
تــا بڵــێم ڕۆژێکــی دیــش ڕۆڵێکــی دی ئــاوا بــووە!

غەیــری تــۆ ئەی بولبــولی بــاغی گوڵســـتانی ئەدەب!
کەی لـــە ڕۆژاوای مەدا ڕۆژێکـــی وا ئـــاوا بـــووە؟

وا "حەقیقــی" شــینی مەرگــی تــۆ دەگێــڕێ "کــامیلا"!
داخەکەم خـــانووی ژیـــانی تـــا بـــووە شـــینگا بـــووە

## بۆ وەفاتی ئاوات

حەقیقی

کامیـــــل! ئـــــاورِ دەوە، برِوانــــە دڵـــــم
تـــــاووتینی دڵ و جەرگـــــی لـــــە کــــوڵم

شەست و حەوت ساڵی رِەفیقـی یەک بــووین
هــــاودەم و دۆســـتی حەقیقـــی یەک بـــووین

نێشـــــــی دوور بــــــوونەوە ئێشـــــــی زۆرە
تەشـــــــەنی کـــــــردووە ئەو ناســــــۆرە

لــە خەمــت جەرگ و دڵـــی لالـــە، رِەشـــە
کام گـــوڵێکی گەشـــە، بــۆت ســەر بــە هەشــە

خـــونچەگـــوڵ نـــایەتە ســـەر لێـــوی بـــزە
بۆیـــە بولبـــول وەکـــوو مـــن مـــات و کـــزە

خاســــەکەو تـــــازە لە کـــــویێ دەخـــــوێنێ
بـــە دڵـــی پـــرِ لــــە پەژارە و خـــوێنێ؟

دڵ لـــە دڵ دەیگـــوت و نـــاڵی و گریـــا
کـــۆچی مـــن بـــا لەبـــری تـــۆ، بریـــا

بـــە گـــرِی ئـــاوری خەمـــت دڵ دەکـــوڵێ
چاوەکـــان ژێـــنەوە ئـــاو هەڵـــدەقوڵێ

کێــــو و کەژ مـــات و کـــز و بێهۆشـــە
شـــــەو سیاپۆشـــــە، کەوی خامۆشـــــە

پـــــاییزە و کـــــاتی گەڵارێـــــزانە
ســـــەفەرە و دەس لەمـــــل ئـــــاوێزانە

ســـــەری کێـــوان بەتەمــــە و هەور و هەڵا
دەوەرێنـــــــــــێ کزەبـــــــا، زەردەگەڵا

شـــــەوە فەرمووتــــــە قەڵای مێـــــردانە
لــــە نەدینـــــت ســـــڵ و ســـــەرگەردانە

ئەی چ داخێکـــــی گـــــران بـــوو کۆچـــت
چ برینێکــــــی بەژان بـــــوو کۆچـــــت

داخەکەم بــــــۆ دڵەکەی گەرم‌وگـــــــوڕت
ئـــاخ لـــە دەســـتی گـــڵەکەی مەیـــل‌بڕت

گـــــوڵ چ قەومــــــاوە کەوا بــــــێڕەنگە
بولبــــولی بـــــاغی ئەدەب بــــێدەنگە

دەردی دووریـــــت ســـــەر و ســـامانی نیـــیە
کـــــوڵی ئەو ژێـــــر گڵـــــە ئامـــانی نیـــیە

گەر لـــە پـــاش تـــۆ هەمـــوو ڕۆژ ئـــاوا بـــوون
کاکـــــە! ئەی چۆنـــــە قیـــــامەت ڕابـــــوون؟

خەم دڵـــــی گـــــرتم و چـــــاو بێنـــــوورە
چـــــاو و دڵ زیــــــز و کـــــزن بمبـــــوورە

کۆڕی شێعرانە وەرە نێو یاران
دۆستان جەمن و نەیاران تاران

لە خەوێ هەستە بڕۆ ڕاوەکەوێ
وەختی خەوتن نییە هەستە لە خەوێ

تۆ بەنێوبانگی بە میوانداری
لاکەوە، لامەدە، تۆو حاشاری؟

ئەسپی بەخت ئەودەمە هاتی تۆ بوو
شا بە خۆ و فیلەوە ماتی تۆ بوو

کەس لە پشت ئەسپی ئەمەل دانەبەزی
تا ببینێ لە ئەجەلدا نەبەزی

گیانە گەر فانییە دنیای دیمان
ژینی هەرمانەیە دنیای دیمان

ڕۆحی پاکت کە لە نێو چاکانە
بۆ منیش ڕەنگە بکا پاکانە

کاتی مردن کە هەموو دەیچێژن
لە پەنا تۆوە دەڵێم بمنێژن

تا بڵێن هەرکەسێ بۆ فاتیحە هات
پێکەوەن گۆڕی "حەقیقی" و "ئاوات"

# بۆ چلەی ئاوات

سەیدعەبدولقادر سەیادەت "سەید"

کاکە لە دوای تۆ نەما تین و گڕ و هاناوەکەم!
هێندەم ئەسرین ڕشتووە سۆمای نەماوە چاوەکەم

سارد و گەرمی ڕۆژگارم من کە زۆر دیوە بەڵام
قەت نەبوو وەک ئاهی سەرد و جەرگە هەڵقرچاوەکەم

من ئەوەندەم ژین دەوێ بێ تۆ کە بۆ تۆ شین بکەم
گەرنە ژینم ژانە بێ تۆ مردنە ژیناوەکەم

ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر دەبێ ئەسرینی چاو گەرچی دەبوو
ئاوی کانیاوی وشک بێ چون نەما سەرچاوەکەم

بۆ چلەت چل ساڵ ئەگەر ماوەم ببێ شیوەن بکەم
ئێستە هەر دەرد و پەژارەم زۆرترە تا ماوەکەم

باسی دڵ ئەمڕۆکە چاو بە زمانی ئەسرین پێم دەڵێ
بوونە ئاوێنەی دەروون چاو و دڵ و زاراوەکەم

"کامیل" ئەی شاسواری مەیدانی ئەدەب! کێ بێ بڵێ
گۆ لە مەیدان دەردەکەم ئەمنیش ئەگەر بێباوەکەم

کەس نییە ئەمڕۆ لە دوای تۆ لێم بپرسێ داخودا
چی بە سەر هات یارە لێقەوماوە دڵ سووتاوەکەم؟

ئارەزووی دیداری تۆ کەوتە قیامەت "کامیلا"!
زوو بە "ئاوات"ی دەگا "سەید"! دڵە سووتاوەکەم

# دەردی گران

عەبدوڵڵا ئەفراز*

مەیگێـــــڕ بگەیـــــە دەردم گـــــرانە
ســــــەرم شــــێواوە دڵــــم پــــڕژانە

مەیگێـــڕ دەزانـــی چەنـــد مـــاڵوێرانم
دەروون پـــڕ خەم و جـــگەر بریـــانم

بـــە مەی تـــۆ نەبـــێ عیلاجـــی نـــایە
ئەو ژانەی ئەمـــڕۆ لـــە جەرگـــمدایە

ســـاقیا! نـــوقمی دەریـــای مەیـــنەتم
مەرگـــی "ئیمـــامی" بـــڕی تـــاقەتم

ســـەبر و ئـــارام و هێـــزم لێبـــڕا
جەرگـــم لـــە دووری "ئیمـــامی" بـــڕا

ئەســـرین لـــە چـــاوم ڕژا وەک بـــاران
مـــاتەمم گێـــڕا لـــە کـــۆڕی یـــاران

کـــاتێ "ســـەیادەت" هەواڵـــی پێـــدام
"کامیـــل" بـــە مەرگـــت بـــۆ مەرگـــت گریـــام

---

* خوالێخۆشبوو مەلا عەبدوڵڵای ئەفراز، ڕۆشنبیر بووە و خەڵکی شنۆ.

فرمێسکی چاوم بەخوڕ هاتە خوار
لە کۆڕی شەوی شێعری "پیرانشار"

ڕاستە نەمدیبووی، بەڵام یارم بووی
مەرهەمی دڵی بریندارم بووی

ئێستێ لە دونیا کە تۆ چوویە دەر
بەجێتهێشت کوێری مات و قەلەندەر

ئەولادی عەلی نەوەی پێغەمبەر
لەبۆ تۆ زوو بوو بچی بۆ سەفەر

"کامیل"! وەفاتت پشتی شکاندم
دڵ و دەروون و مێشکی تاساندم

ڕەشەبای مەرگ تۆی پێچایەوە
بردی لەگەڵ خۆی، گلی دایەوە

هەر دەڵێی گەردوون قینیەتی لێمان
هەر ڕۆژ زانایێ ناهێڵێ پێمان

بۆ "هێمن" چاوم وشک نەبۆوە
شینی ئەتۆشم بۆ تازە بۆوە

خۆزگە "ئەفزار"یش نۆرەی هاتبا
تا بە کاروانی سەرووەران گەیبا

۸١/۹/١۸ی هەتاوی

# شین بۆ ئاوات

نافیع عەلایی

بەرەو وەرزی خـــەزانە و هـــەوری مـــاتەم
ڕژانـــی دەمبـــەدەم بەفـــری تـــەم و خـــەم

زرەی خســـتە جیهـــان، زەنگێکـــی نـــاخۆش
هەزاران عاشـــــقی بەســـــتە ســــــیاپۆش

پەپـوولەی شـەمعی شـێعری خۆشـی کـوردی
درێغـــا خـــاکی ڕەش ئەســـتاندی، بـــردی

دە بولبـــول شـــیوەنت لابە لە ســـەر چـــڵ
بەرەو گـــڵ بـــی، بەرەو گـــڵ بـــی، بەرەو گـــڵ

لەگەڵ ئـــێمە دە هەڵـــکە ئـــاه و نـــاڵە
بە شـــیوەن زوو بە تـــۆش، زوو بێـــرە گـــاڵە

ئەدا کـــوڵ مەنجەڵـــی دڵ بـــۆ پەڕی گـــوڵ
لە ژێـــری‌دا وەجـــاخە، ســـکڵە یـــا کـــڵ؟

ئەســـــەف بـــۆ بـــاخەوانێکی بەئەزمـــوون
ئەسەف بـۆ بـابی نـوکتە و شـێعر و مەزمـوون

ئەمـــن ئیمـــڕۆکە شـــینم ســـوورە، گەش‌گەش
لە چـــاوم دادەبـــارێ قەتـــرە بـــێ‌غەش

ئەگەر بیێن گوێ بدەن بۆ ئاه و ناڵەم
نە سەنتوورە، نە نەی سازی سکاڵەم

لەگەڵ مندا دەگرین چەرخی گەردوون
لە گریانە ئەگەر بەرزە، ئەگەر دوون

گوڵێ ئێمەی ببین پێ مەست و سەرخۆش
مەگەر سەرپۆش ببین، بیکەین فەرامۆش

بەرۆکت بدڕە هەی گوڵ، خۆ بنێ گڵ!
وەکوو خونچە ببە پڕخوێنوخوڕ، دڵ!

چەمەن لاکوڵمی ڕووشاوە، بزانە
کە جێی نینۆکی پڕژانی خەزانە

کە بیستم مەرگی چیمەن، کەوتمە ناڵین
گەییبوو، ئێمە هەروا کرچوکاڵین

پسا بەندی دڵی هونەر، هەواڵە
وەکوو خۆراکی ژارە، تورت و تاڵە

نەسیم! دەستت بنێرە چۆک و ئەژنۆت
بە دەمیا دە ئەگەر گوڵ پێکەنی بۆت

فەلەک! ڕەشپۆشە، پڕ شین و خورۆشە
کورەی خورشیدە وەک دڵ من لەجۆشە

لە خەرمانان بەجێما غەم بە خەرمان
بە مەرگی "کامیل"ی ئایین و ئیمان

ئەسەف تۆ بیری بەرزت بردە ژێر خاک
منی غەمباری سینە و دڵ لەت و چاک

بە شێعری نزمی خۆم شینت دەگێڕم
هەموو نارێکە ڕستە و بەند و دێڕم

دەڵێم بگریم بە هاوار و بڕێژم
بە دەریا خوێنی دڵ، خۆی لێ بنێژم

خودایا بەزمی گوڵشەن بۆ خەمۆشە!
چییە ساقی! دەروونت وا لەجۆشە؟

ئەرێ موتریب! مەگەر دەستت شکاوە؟
کە سازی بەزم و شادیت نایە لاوە

ئەوێستێ کۆڕی ماتەم وا لە گۆڕێ
دیارە دەنگی سازی مەش دەگۆڕێ

تەواوی ڕەگ‌ڕەگی جەستەم بە ئەستەم
دەسی لێ‌دەی دەگێڕێ شینی ماتەم

لە داخی هەڵوەرینی گوڵ لەجۆشم
وەکوو بولبول لە ناڵین و خرۆشم

شەرارەی غەم دەکا ئەنجن دڵی من
دڵم دەریایەکە پڕخوێن و بێ‌بن

تەنی خاکی نە جێگەی ڕۆحی تۆ بوو
بەرەو بەرزی، بەرەو ئاسۆ دەچوو، چوو

دریـــغ ئەی دڵ! لە بـــن گــــڵدایە ئـــاوات
بە مەرگـی شـاهی شـادی بـوو کـش و مـات

شـێعر ڕەش‌پۆشــە، یەکســەر بەحـری شـینە
غەزەل شـــــێواوە، دڵناخۆشـــــی ژیـــــنە

لە تـــاوا قـــافیە خـــۆی کـــرد بە دارا
ڕەدیـــف ئێســـتاکە بـــێ‌نەزمە و مـــودارا

لەف و نەشـری مـوڕەتتەب بـوو موشـەووەش
کە بیســـتی ئیســـتیعارە، کـــردی زوو غەش

جینـاس ئەجناسـی خـۆی گشـت دا بە تـاڵان
ئەدی خـــۆ نـــاکریتۆ بـــۆی بە ســـاڵان

"وەفـــایی" هـــاتە پێشـــواز، کەوتە ڕێـــگە
کە "نـــالی" بیســـتی، نـــاڵی دەس‌بەجـــێگە

ئەڵـێ "هـێمن" بە "مەحـوی": کـاکە! وا هـات
چـرای ڕوونـاکی کـۆڕی ئـێمە، "ئـاوات"

بە "تـــاهیربەگ" دەڵـــێ "نـــاری": هەڵێـــنە
ســـەرت، دەی‌دەی، دە پەی‌پەی مەی بهێـــنە

کە بیســـتی "مەولەوی" تەبعـــی خورۆشـــی
لە مەیخـــانەی غەیـــب، جـــامێکی نۆشـــی

کە "حاجی‌قـــادری کـــۆیی" بە بەســـتە
دەکـــا خێرهـــاتنی ئەو پیـــرە خەســـتە

دەڵـــێ "قـــانیع": قەنـــاعەت بەســـیە ئیـــدی
لە تەنیـــایی بەدەر بـــێ، بەســـیە چـــی‌دی

بە کـــوردی کـــاکی "کـــوردی" دێـــتە ئـــاواز
"حەریـــق" و "ســـالم"ن پێشـــەنگی ڕێبـــاز

دەڵـــێن خـــۆش هـــاتە نێـــو ئەم بەزمـــی ئـــێمە
لەبـــۆ ئەنگوشـــتەری ئـــێمە نقـــێمە

ئەرێ ئیلهـــامی شـــێعری تەڕ بە مەولا!
لە تـــۆ شـــێواوە جـــێگەژوان لەمەولا

کە وەک "کامیـــل" گـــلاوە تاکەســـواری
لە خـــامەی کێـــوە تک‌تـــک دێـــتە خـــواری

غەمێکـــــت "نافیعـــا" وت لە هەزاران
ئەوی دیـــکەی بڵـــێ بـــۆ غەمگوســـاران

سەقز، ۱۳۶۸/۶/۶ی هەتاوی

# بۆ وەفاتی ئاوات

حاجی سەیدجەمیل هاشمی

بــۆ خوداناســی گەلــی پیــر و جەوان، بــا بگــریم
بـــۆ ســـکاڵای دڵەکەی نیوەشـــەوان، بـــا بگـــریم

هــۆنەران بــوونە پەپــوولەی شــەمەکەی دیــوانی
بــۆ وتەی خــاوەنی ئەو تەبعــی ڕەوان، بــا بگــریم

خــواری کــرد توولەنەمــامی مــوژەکەم ئەســرینم
تاکوو تیر دەشــکێ لە نێــو مــاڵی کەوان، بــا بگــریم

ڕەش بووە چەشــنی گلێــنەم لە خەمــی، ڕۆژی مــن
چــاکە ئەســتێرە لە عاســمان و حەوان، بــا بگــریم

پێشکەشــت شــینی دڵــم، حــاتەمەکەی کوردســتان!
چیــیە بــۆ هــۆنەرەکەی خاســەکەوان، بــا بگــریم

بـــۆچمە ژینـــی لەمەولا، کە نەمـــا "ئـــاوات"م
تــا دەمێنــێ لە لەشــم تــین و تەوان، بــا بگــریم

"هاشمی" هەروەکوو تۆ خەڵکی هەموو بۆی دەگرین
مــافیە، جێیەتــی بــۆ خــۆم و ئەوان بــا بگــریم

## بۆ مەرگی ئاوات

مامۆستا مەلا کەریم ڕاوچی

فەلەک نەیهێشـــتەوە بۆمـــان پشـــوویەک
لە دڵ دەچزێنـــێ هەر ســـاڵێ چـــزوویەک

گوڵـــووکی گوڵشـــەنی هـــێمن و هەژاران
بە ســـاوایی لە پـــای دەخـــرێ دڕوویەک

بـــزەی ســـەر لێـــوی خـــونچەی پێنگەیشـــتوو
دەخـــاتە ژێـــر پەلامـــاری کەڕوویەک

ســـتێرەی ڕۆشـــنی کـــوردم بـــوێژن
ئەوانـــیش ڕوو لە ڕۆچـــوونن بە دوویەک

نە "هـــێمن" مـــا لە ئـــارادا، نە "ئـــاوات"
خـــودا! بـــۆ کـــوردی بـــێ ئـــارا دەروویەک!

شـــەمی شـــانازی کـــۆمەڵ بـــوو شـــنەی ئەو
ئەویشـــت کـــردە قوربـــانی بە فـــوویەک

بە کـــۆچی ئەو هونەرمەنـــدە، گەلـــی کـــورد
دەڵێـــی بـــوونە مەکـــۆی شـــین و گـــڕوویەک

پزیشـــکی شـــیوەنی خەڵکـــی، دەترســـم
بســـووتێنێ هەمـــوو خـــوار و ســـەرووبەک

بەرەو بابـــا و شـــێخمەحموودە کۆچـــت
لەمەولا بـــۆت نیـــیە تـــرس و تەزووبەک

بە شێخمەحموودی خـۆت بێـژە: هەڵەبـجەی
بەبێ‌هـــۆ چـــۆتە نێـــو زاری زەرووبەک

کە لاوێـــکە ســـکەی «داری کەلـــی» ئەو
بەعـس بـردوویە هەر بـوون و نەبـوویەک

لە بەرزایـــی ژیـــانی تـــۆ "ئیمـــامی"!
نەبینـــراوە خەل و خەوش و گولـــوویەک

قوبـوول نەکـراوە "ڕاوچـی" بـۆ بەڵاگێـڕ
دەنـــا بـــاریکترە گەردن لە مـــوویەک

خەرمانانی ١٣٦٨ی هەتاوی

# تۆزی خەمێ

محەمەدسەعید نەجاری (ئاسۆ)

تـــــۆزی خەمـــــێ لەم گەلە وا نیشـــــتووە
چـــاوی خەم و دەردی بە جـــووت ڕشـــتووە

شـــاعیر و نووســـەر هەمـــوو چـــاو پـــڕ نەمـــن
عـــارف و عـــامی هەمـــوو دڵ پـــڕخەمن

دەشـــت و دەمەن هـــاتنە گریـــان هەمـــوو
ورد و درشـــت خـــاکی موکریـــان هەمـــوو

بـــۆ چیـــیە وا خەنـــدە لە لێـــو مـــردووە؟
دەســـتی ئەجەل کـــێهە کەســـی بـــردووە؟

ئەو دڵـــی ئـــاواتە کە قەت نەســـرەوت
بەو هەمـــوو ئیحساســـە لە لێـــدان کەوت؟

دەک نەفەســـت تاســـێ بە تاســـەم ئەجەل!
بێـــتە ملـــت دەینـــی هەناســـەم ئەجەل!

خـــۆ ئەوە کـــامیلە لەمەت ســـاندەوە
نەزم و نیزامـــــــی کەلـــــــیمە هەر بەوە

نـــایەتە ســـەر زاری شـــێعر یەکنەفەس
چەشـــنی بـــزەی لێـــوی هەمـــوو قەوم و کەس

مـــن چ بڵـــێم ئێســـتە لە شـــەرحی فیـــراق
لاڵە زمـــــانی قەڵەمـــــی ئیشـــــتیاق

مــن لە خەمــت چــۆن بە دوو چــاوم چەمــێ
چــاری دەکــا ســـۆزی دەروونـــم کەمــێ

شـــاهمی، ئـــاواتمی، شەمســـی منـــی
تـــازە بە یەکجـــاری لە ئاســـۆ ونـــی

جـــا مەگە مـــن بـــبمە گەدای مەولەوی
تێکەڵـــی نەی کەم گـــڕی شـــێعرێ لەوی:

«جـــان جهـــان دوش کجـــا بـــودەای؟
نـــی غلطـــم در دل مـــا بـــودەای»

مـــدفن تـــو تک‌تـــک دل‌هـــای ماســـت
کـــی تـــو بمـــردی کـــه نمـــردن تراســـت

کـــوا دەمـــرێ ئەو کەســـە بـــۆ گەل ژیـــا؟
دســـتی ئەجەل بـــا لە گەلـــی کـــا جیـــا

مـــن غەمـــی تـــۆ کـــاکە بە چـــی دەربـــڕم!
هێنـــدە لەبەر کـــۆچی ئەتـــۆ دڵپـــڕم

هەروەکـــوو زەنبیلـــی ئەتـــۆ مـــاڵی دڵ
تێکچـــووە، ڕووخـــاوە، کەچـــی دێـــتە کـــوڵ

هێنـــد لە کـــوڵە وەک دڵـــی "جەعـــفەر"* لەبـــۆت
گـــوێگرە ئاســـۆکەتە، شـــاگردی خـــۆت

دیـــدەنی دیـــداری مە ڕۆژی حەشـــر
شـــاد بـــێ ڕوحـــت شـــاعیری پیـــری نەمـــر!

---

* جەعفەر کوڕی بچووکی "ئاوات"ـە..

# وێنەکان



ساڵی ١٣٠٣ی هەتاوی



ساڵی ١٣١٢ی هەتاوی



ساڵی ١٣٣٥ی هەتاوی



ساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی



ساڵی ١٣٥٣ی هەتاوی



لە ڕاستەوە: ١. ئاوات ٢. سەید عەبدولقادر گەیلانیزادە ٣. حاجی سەید عەبدوڵلا گەیلانیزادە ٤. حاجی محەمەدڕەسوڵ کەبوودی

ساڵی ١٣٣٠ی هەتاوی ــ مهاباد، ماڵی کەبوودی



لە ڕاستەوە: ١. ئاغا سەید عەزیزی سەیادەت ٢. ئاوات ٣. مەلا حەسەنی ئەبووبەکری شیلاناوی ٤. حەبیبوڵلاخانی بوداقی ٥. ؟

ساڵی ١٣٢٤ی هەتاوی ــ گوندی تورجان



لە ڕاستەوە: ١. سەید محەمەد تەهازادە ٢. ئاوات

١٣٢٦ی هەتاوی ـ زیندانی ورمێ



لە ڕاستەوە: ١. عەزیز سەدیقی ٢. ئاوات ٣. سەید مستەفا سەیدی

ساڵی ١٣٢٦ی هەتاوی ـ زیندانی قەزوین



لە ڕاستەوە: ١. حاجی ڕەحمانئاغا موهتەدی ٢. ئاوات
ساڵی ١٣٤٤ی هەتاوی ـ بۆکان



ئاوات (ساڵی ١٣٥٥ی هەتاوی ـ قاقڵاوا)



لە ڕاستەوە: ١. ئاوات ٢. کاک حەمەساڵەی خاڵەمینە
ساڵی ١٣٥٧ی هەتاوی ـ بۆکان



لە ڕاستەوە: ١. حەقیقی ٢. ئاوات ٣. خاڵەمین بەرزنجی
ساڵی ١٣٥٨ی هەتاوی ـ مهاباد



لە ڕاستەوە: ١. هەمزەئاغا حەمیدی ٢. حەقیقی ٣. ئاوات ٤. هەژار
٥. سەید تاهیر ئیمامزەنبیلی ساڵی (١٣٦٤ی هەتاوی ـ بۆکان)



لە ڕاستەوە: ١. حەقیقی ٢. ئاوات ٣. هەژار
ساڵی ١٣٦٤ی هەتاوی ـ بۆکان



لە ڕاستەوە: ١. حەسەن‌ئاغا حیسام‌قازی ٢. حاجی سەید عومەر هاشمی ٣. حاجی سەید ئەنوەر هاشمی ٤. مەنسوور هاشمی ٥. قاسم‌ئاغا موهتەدی ٦. ئاوات ٧. محەمەد نووری ٨ مامۆستا سەید ئەحمەد شەمسی ٩. سەید حەمید ئیمام‌زەنبیلی (ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی ـ قاقلاوا)



لە ڕاستەوە: ١. ئەحمەد مەولانی ٢. سەلاحەددین ئاشتی ٣. حەقیقی ٤. ئاوات
ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی ــ سەقز



لە ڕاستەوە: ١. مستەفا ئیلخانیزادە ٢. ئەحمەد مەولانی ٣. حەقیقی ٤. ئاوات
٥. سەید تاهیر ئیمامزەنبیلی (ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی ــ سەقز)



لە ڕاستەوە: ١. حەقیقی ٢. ئاوات ٣. سەلاحەددین ئاشتی
ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی ـ سەقز



لە ڕاستەوە: ١. ئەحمەد مەولانی ٢. حەقیقی ٣. ئاوات
ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی ـ سەقز



لە ڕاستەوە: ١. حەقیقی ٢. ئاوات
ساڵی ١٣٦٨ی هەتاوی ـ سەقز